**دەستەی ڕاوێژکاران**
حسێن عارف
ڕەووف بێگەرد
ڕێبین ئەحمەد هەردی

**سەرپەرشتی گشتی**
شێرکۆ بێکەس

**بەڕێوەبەری ڕۆڤار**
دڵشاد عەبدوڵڵا

**ئەندامانی کارگێڕ**
عەتا محەمەد
فەرەیدون پێنجوێنی

**سەرپەرشتی هونەری**
قادر میرخان

2

5/6/1999

## دارا حەمە سەعی

١٩٤٦ لە سلێمانی لەدایك بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لەسلێمانی تەواوکردووە. ١٩٦٩ بەکالۆریۆسی لە ئەکادیمیای بەغدا بەشی پەیکەرسازی بەپلەی زۆرباشە و یەکەمی شێوەکاریی بەدەستهێناوە. ١٩٧٨ لیسانس بەپلەی زۆرباشە لە ئاکادیمیای ڕۆما بەشی پەیکەرسازیی هێناوە. ١٩٧٩ دیبلۆم و بڕوانامەی تایبەتمەندی هونەری دراو و مەدالیای لە ڕۆما بەدەستهێناوە. ١٩٨٤ گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی بەیەکجاریی. ١٩٩٣ ماجستێری لە زانکۆی سەلاحەدین وەرگرتووە. بۆماوەی چوار ساڵ ئەنترۆپۆلۆجیای کولتوریی و فەلسەفە و مێژووی هونەری خوێندووە. جگە لە چالاکی هونەریی چالاکی نووسینیشی هەیەو لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکاندا گوتار بڵاو دەکاتەوە. پەیکەری بۆ پیرەمێرد و مەولەوی و گۆران و عیزەدین فەیزی و مام هەژار و گیومۆکریانی و خێراللە[illegible] گادگروس و گەلێ کەسایەتیی کورد و بێگانەی کردووە. مامۆستا بووە لە پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی سلێمانی.

ئێستاش یەکێکە لە مامۆستایان و دامەزرێنەرانی کۆلێجی هونەر لە زانکۆی سلێمانی.



## هەندێ پەیە

• مارکیز زۆربەی ڕۆمان وچیرۆکەکانی لەئەنجامی گوێ بیست بوون دارشتووە، جارێکیان چیرۆکنووسی بەتوانا "جەلیل القیسی" لەگۆڤارێکدا هەواڵێك دەخوێنێتەوە دوای ماوەیەك شانۆگەری زفیر الصحراء – دەنووسێ، کەمن هەرجارەی دەیخوێنمەوە لەشوێنی خۆم ڕادەچڵەکێم، لەسەر دەمی ئەمڕۆماندا ڕووداوەکان ئەوەندە خێراو سەرسوڕهێنەرن نووسەر فریای هەر هەموویان ناکەوێت، بەڵام ئەوەی کە مەبەستی بێت هەر دایدەڕێژێ. لەگەشتێکمدا ئاسیاوێم لەگەڵ نووسەرێکی بیانی پەیداکرد، هەزاران کیلۆمەتری بڕیبوو بۆئەوەی ئەوگەڕەکە ببینێت کە ڕووداوی شێت بوونی پاڵەوانی چیرۆکەکەی لێقەوماوە، لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو ڕووداوەکەی لەداپیری برادەرێکیەوە بیستبوو. من لە منداڵیما برسیەتی و سەرگەردانی و بێبەشیم زۆر دیوە، ئەمڕۆکە لوقمەیەکی چەوردەخۆم، ئەو ڕۆژانەم وەبیردێتەوە؛ کاتێك لەنێو، پێخەف و نوێنی گەرمدا دەخەوم سەرماو موچوڕکی جارانم بەلەشدا دێت، هەر لەم پێودانگە شەوە چیرۆك دەنووسم. دیستۆفسکی کت ومت ژیانی خۆی‌خستۆتە سەر کاغەز، بەڵام ئەوەندە هونەرمەندانە دایڕشتووە کە مرۆڤ دەیخوێنێتەوە هەست دەکات داهێنانە هەموو نووسەرانی جیهان سوودیان لەژیانی ڕۆژانەی خۆیان بینیوە.

زۆرجار سکم بەپاڵەوانەکانی "ڕێگا" وەدەست و پلی خۆم دەسوتێ، شەو نی‌یە جێ گۆڕکێ‌یەك‌یان پێ نەکەم و نەیانهێنمە قسە. من لەنووسیندا زۆر قلق– م تا دە دێڕ دەنووسم دوولاپەڕە تێك هەڵدەشێلم، جا ئەگەر نووسینەکە ڕۆمانیش بێ ئەوا هەرمەپرسە ئەم ساڵ (١٩٨٧) نەخۆشی وایلێکردووم نەپەرژێمە سەری، ئەو ڕۆژانەی هەست بە هێور بوونەوە دەکەم، ئیشی تێدادەکەم، لەپڕ ژان و بروسك هێرش دێنن، تۆزێك دان بەخۆمدا دەگرم، سەیردەکەم گەیشتوومەتە ئەو حاڵەتەی کەیەکێك لە پاڵەوانەکانی ڕۆمانەکەش تووشی سەغڵەتی بووە، ئازار تەنگم پێ هەڵدەچنێ، ڕادەکشێم.. ئازانم دەخەوم یان نا، بیرم هەرلای کاروانی گەنم–ە (بەشی یەکەمی ڕێگا).

لە "ڕێگا" دا هەوڵم داوە سەربوردەی مرۆڤی سەر ئەم خاکە لەپێناوی مان و نەماندا بگێڕمەوە، زۆرم لەخۆنەکردووە، نەشم ویستووە هەقایەتان بگێڕمەوە، چونکە ئەوە نزیکە ١٨ ساڵە بیرۆکەی ئەم ڕۆمانەم داڕشتووەو ئیشی تێدا دەکەم.

شانازی بەنووسەرە لاوەکان دەکەم، ئەوانەی خوێنەری ڕاستەقینەن ئینجا نووسەرن.

لەفەرهەنگی ژیانمدا ووشەیەك نیە ناوی "ڕق" بێ، ئەڕقم لەکەسەو لەو بڕوایەش‌دام کەس ڕقی لێم نییە، خۆ ئەگەر هەشبێت من بەخۆشەویستی گوڵاو پرژێنی‌دەکەم.

**سەرچاوە:** هاوکاری ژمارە (٩٢٥) ١٩٨٧/١١/٢٣ "بەر لەکۆچی دوایی بەمانگێك: ٦ پرسیار لەبەردەم "مەم" ی زیندوودا.. ئیسماعیل بەرزنجی"

(ڕۆڤار) مانگانەیەکی ڕۆشنبیری‌یە و ژمارەی تایبەتی بە داهێنەرێك

ناونیشان: سلێمانی فولکەی یەکگرتن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار– ت: ٢٩٨٣٩

لەدەرەوەی کوردستان:

TEL: 0044 162 846008 FAX: 0044 162 84 77660



چیرۆکنووس

## محەمەد مەولود مەم

• لە ١٩٢٦/٢/٢٣ لەشەقڵاوەی سەربەپارێزگای هەولێر لەدایك بووە و ماوەی تەمەنی منداڵی ئەوێ ژیاوەو سروشتی ناوچەکەو بەتایبەتی سیحری چیای سەفین دواتر لەبەرهەمەکانی ڕەنگی داوەتەوە.

• ساڵی ١٩٣٨ هاتۆتە هەولێر بۆ خوێندن.

• لەبەرنالەباری و نەداری تەنها قۆناغی ئامادەیی تەواوکردووە، ١٩٤٣/٩/١ بۆتە مووچەخۆر و بەفەرمانبەری زوربەی ناوچەکانی‌کوردستان گەڕاوە، سەرەتا کاتبی ناحیە بووە لە برادۆست و تا ساڵی ١٩٥٢ لە مێرگە سوور و برادۆست و باڵەك و شەقڵاوە دەژی.

• ساڵی ١٩٥٣ دەگەڕێتەوە شەقڵاوەو دواتریش لە ١٩٥٦ تا ١٩٥٧ لە کۆیە بووە و لەبەهاری ١٩٥٧ چۆتە ڕواندزو حوزێرانی ١٩٦ گەڕاوەتەوە هەولێر و بووە بە بەڕێوەبەری شارەوانیەکانی هەولێر و لە ١٩٧٧/٦/٦ خانە نیشین کراو.

• یەکەم بەرهەمی پەخشانێك بووە لەگۆڤاری گەلاوێژ بەناوێکی خوازراوەوە بڵاوی کردۆتەوە، جێگەی داخە ئەو ناوە خوازراوە ... ی پەخشانەکەمان بۆ نەدۆزرایەوە.

• لەپەنجاکانەوە چیرۆك بڵاو دەکاتەوە، لەگۆڤارەکانی هیوا، بڵێسە، شەفەق، دەفتەری کوردەواری، هەولێر ... هتد. و یەکەم چیرۆکی بەناوی "برسیەتی بەهێزترە" بووە.

• ساڵی ١٩٥٧ چیرۆکی "پەنجا فلس" ی لەگۆڤاری هیوادا بڵاوکردەوە. کەلەساڵی ١٩٥١ لە برادۆست نووسویەتی.

• سەرنووسەری گۆڤاری هەولێر بوو کە لەنێوان ٢٣/ئایاری/١٩٧٠-١٩٧٢ شارەوانی هەولێر دەری دەکردو لەوێ بەناوی خاڵۆی ڕێبوار دەینووسی.

• تائە ژیاندا بوو ئەم بەرهەمانەی چاپ کردووە:

- بەرگی یەکەمی چیرۆکەکانی مەم ١٩٧٠.
- بەرگی دووەمی چیرۆکەکانی مەم- ١٩٨٤.
- گوڵەبەڕۆژە "کۆمەڵە چیرۆکی منداڵان"- ١٩٨١. کەبەهاوکاری خاتوو ئافەرینی هاوسەری نووسیویەتی.

• پاش کۆچی دوایی ئەم بەرهەمانەی چاپ کراون:

- نوڤلێتی "پایزە خەون" بەغدا ١٩٨٧.
- ڕۆمانی "ڕێگا"- سوید ١٩٩٤.
- چیرۆکی میللی کوردی- سوید ١٩٠٨.

• ئەم دەستنووسانەی ئامادەن بۆ چاپ:

- ڕۆمانی "کاروان و سەگوەڕ".
- شانۆگەری "پیلان".

• ئاتێستا زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە دەربارەی ژیانی "مەم"، کۆچی بنەماڵەکەیان لەدێی سینگانی سەربەناحیەی شنۆی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بۆ شەقڵاوە لەدوای یەکەم شەڕی جیهان، ترس و گرێی سنوور و پەڕینەوەی لەناخیدا پەنگان خواردبوو، نا ئارامیەکیان دروست کردبوو کە لە هەڵسوکەوتی مەم دا ڕەنگی دابووەوە. بەجۆرێك کە دەتبینی دەتزانی دەرگایەکی داخراوە وەڵێ ڕەشەبا لەناوەوە پاڵی پێوەدەنێ.

• چەند جارێك چۆتە ئەورووپاو ئاوو هەوای ئەماوی لەندەن زۆر سەرنجی ڕاکێشاوە.

• دوای ململانێیەکی درێژ لەگەڵ جۆرەها نەخۆشی ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٨٧/٥/٧ لەبەغدا کۆچی دوایی کردو لەگۆڕستانی گردی زەیتوون لەشەقڵاوە بەوخاکە سپێردرا کە هەر زەڕەیەکی ئیلهامی چیرۆکێکی پێبەخشیبوو.

• یەکێکە لەپێشڕەوانی چیرۆکی ڕیالیستی کوردی، و لەبەرهەمەکانی دواییدا ئەو ڕیالیستەی تێکەڵ بە سیحرکردو، ئەو تێکەڵ بوونە کە خەیاڵێکی فراوان لەپشت دروست بوونیدایە ڕیالیستێکی سیحری داهێنا و لە "پایزە خەون" و "ڕێگا" بەڕوونی دیار کەوتووە.

• ئەندامی یەکەمین کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانی کوردو ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی و سەرۆکی لقی هەولێری کۆمەڵەکەش بووە.

• مەم ساڵی ١٩٦٤ (ئافەرین) خانی هێناوەو نەوەکانی:

هونەر (ئێستاله سویدە)، سۆران (ئەندازیارە لەهەولێر)، بۆتان (لە ئەڵمانیا دەژی)، سیامەند (هەولێر)، بڵند (خوێندکاری‌کۆلێژی یاسایە لە هەولێر)، پێشەوا (خوێندکاری ئامادەییە)، سۆزان (ئەندازیارە لە هەولێر)، لەیلێ (دەرچووی کۆلێژی پەروەردە/ بەشی دەروونناسی).

## کورتە چیرۆک

# پەنجا فلس..

ئەو بەیانیە، ئەمن و نە کاک مەحموود، چ کامێکمان ئارەزووی لەناو جێگا هەڵستانمان نەدەکرد!! وامان لێ خۆش دەهات، کەهەتا هەتاین.. هەر لە ژێر نوێنە شڕەکانمان پاڵ کەوین. من هەر لەگەڵ سپێدەی بەیان، لەگەڵ بانگی (مەلا)، هەر گەوزم دەداو هەستم بە ئازارێکی نادیار بەلەشێکی گران.. گەروویەکی ووشك و تاڵ دەکرد!! بیرم لە ئازاری لەشم دەکردەوە.. خۆزێی سوێرم قووت دەدایەوە، کاتێك کاکەشم.. خۆی خستە سەر تەنیشت، چاوی هەڵهێنان، بە دووچاوی لێڵ و بەڕوویەکی گەچلاو سەیرێکی کردم!! ئەوکاتە ڕۆژ قەڵاتە بەرزە پیرەکەی هەولێری خستبووە ژێر تیشکی خۆی و زەردی هەڵگەڕاندبوو.

- بەڵام، ئارەزووی، لەناو جێگا هەڵسانی چی بکەین؟؟!

خۆ ئەو بەیانیە، جگە لە هەموو بەیانیەکانی ڕابوردوومان.. چ شتێکی بۆ خواردن دەستی بدابایە نەمان بوو!! نەنان.. نە شەکرو چای.. بۆ ئەوەی نان و چایێك بخۆین.. نان و چای.. کە تاکە خواردنە خۆشەویستەکەمان بوو..

دوێنێ تاکو ڕۆژئاوا، هەردووکمان لەگەڕاج چاوەنواڕیمان دەکرد، کەس و کارمان.. نە.. نان.. نەپارە.. چ شتێکیان بۆ نەناردین!! وا هەردووکمان کە لەژێر نوێنە شڕەکانمان لێی درێژ ببووین.. داماوی ئەوەیش بووین کە دەبێ بۆچ هیچیان بۆ ڕەوانە نەکردین؟! نەبێ ئەوانیش ناردیان نەمابێ؟ یان شتێکیان بەدەستەوە نەبێ؟! هەموو شتێك دەبێ، هەموو شتێك لەم گرانیە دەوەشێتەوە، لە چۆنیەتی خێزانە هەژارەکانی وەکو ئێمە!! ئەگینا جاران هەر هەفتە.. بە هەفتە، یەك جۆرکی پڕ نووردیەنانمان بۆ دەهات، هەندێك جاریش، کەمێك دۆشاو وەیا مێوژ و گوێزیشی لەگەڵ دەبوو، بەتایبەتی ئەگەر هەفتەی دوایی؟ مانگ بوایە، ئەوا چارێگە دینارێکیشیان، هەر بۆ دەناردین. ئیتر هەقمان بوو کە قەوماوی ئەو هەفتەیە، لە دەریایێکی بیری قووڵی ترسێنەر، نوقممان بکا!!.

ئەم خەیاڵاتانە، هەڵیان دەگلۆفتم کاتێك کاك مەحموودم بەبێ.. پێشەکی بانگی کردم:

- کاکە.. مەم، کاکە.. مەم، باهەڵستین بچینە مەکتەب، بەخوا ئیمڕۆ دەرسی گران گرانمان هەنە، شەوی ڕابووردووش، بەزگی برسی نەمانتوانی بەسەر دەرسەکانماندا بچینەوەو تێکۆشانێك بکەین.

کە ئەو دەمی لێك دەداو قسەی دەکرد، زگم قۆڕەی دەهات، پێچی دەکرد.. منیش دەستم پێدا دەهێناو دەبرد، وەکو بمەوێ هێمنی بکەمەوە، لەبەر ئەوە بەچاکی لە قسەکانی کاکم.. حاڵی نەبووم بۆێ.. لەوەڵامدا گوتم:

- باوەڕت بێ، کاکە مەحموود، لەبەر ناڵەو دەنگ و هەرا و قۆڕەی زگم..زگی برسیم، گوێم لە نووسکە نووسکی تۆ نیە! دەنگت هەندێك بەرزکەوە تا بگاتە گوێم!

چونکی چارەمان نەبوو هەر دەبوایە بچوینایە قوتابخانە بۆیە زۆری پێ نەچوو بەلەشی گران، زگی تووڕەو وەڕس بەخاوی هەڵستاینە سەرپێ، ئەختێك خۆمان لێك کێشایەوە، بێ ئەوەی هێزی ئەوەشمان بێ هەندێك ئاو لە بیرەکە هەڵکێشین و، دەست و چاومانی پێ بشۆین، لە دەمی خانووە قوڕینەکە بەرەو کۆڵان، خۆمان هاویشتە دەرەوە و ڕێگای قوتابخانەکەمان گرتە بەر.

بەدرێژایی کۆڵانە تەنگ و درێژەکە بۆنی هێلکە و ڕۆن و پەنیرو ناسکە نان.. گۆشتی برژاو.. چاو خواردەمەنیی خۆش خۆشمان دەهاتە کونە لووت بەهەموو هێزمان هەناسەی درێژ درێژمان هەڵدەکێشا.. بۆ ئەوەی.. بەو بۆنە خۆشانە سیپەلکمان ببووژێنینەوەو هەندێك شۆڕشی زگمانی پێ دابمرکێنین!! لەبەر ئەوەی.. من بچووك و کورتە باڵابووم، توانای بزوتنەوەو ڕۆیشتنم لەکاك مەحموودی درێژ.. لاواز زیاتر بوو. هەردووکمان لەڕو لاواز بووین، بەڵام من قوتەو تێك چەقیوو ئێسك ئەستوورو.. ئەو زراو کشاوە بوو!! بۆیە من بەدوورم نەدەزانی ئەگەر ڕەشەبایەکی بەتین هەڵی بکردبایە کاکە مەحموودی ڕادەقەناند، ئەگەر منیشی وەك تۆپەڵە بە دەشتاییەکەی نزیك قوتابخانەکە گلۆڵ نەکردبایەوە؟ بەڵام لەم لایەوە بەختیار بووین! چونکە شەوی ڕابوردوو بارانێکی بەهاری کۆچەو کۆڵان و دەشتاییە خۆڵاویەکەی (تەپراوە)ی چاك ڕشاندبوو، لەبەر ئەوە بۆ خۆ ڕاگرتن هێزمان پێ نەدەویست، مەگەر بۆ ئەوەی پێمان بگوێزینەوە.

کە نزیك قوتابخانە بووینەوە لەناو قوڕەکەی بەردەمم چاووم بەپەنجا فلسییەکی سپی کەوت! بەبێ بیرکردنەوەو بەهێزێکی سەیر وەك چۆن پشیلە پەلاماری نێچیر دەدات ئەناوا پەلامارمدا.. وەکو لەوە ترسابم لەبەر دەستتم ببەزێ! هەڵم گرتەوە.. مستێك قوڕیشم لەگەڵ هێناو بەبێ دەستی خۆم خستمە ناو گیرفانم!! ئاوڕێکی گێلانەشم لە کاك مەحمود دایەوە، بۆ ئەوەی بزانم ئاخۆ چاوی لە چۆنیەتی من بووە؟! و ئاگاداری ئەو هەرایەو ئەم ڕاوو ڕاوشکارەیە.. یان..نا؟! وادیار بوو کاك مەحمود بەووردی ئاگاداری چۆنیەتیەکەیە کاتێك بەدەمێکی تێك ئاڵاو گوتی:

- ئای ئەوە پارەت دۆزیەوە؟.. چەند بوو؟ پەنجا فلس!؟.

هەردووکمان کڕومات بووین، لەخۆشیانا زمانمان بەسترا، من وام دەزانی هەموو دنیام دۆزیوەتەوە!! لەبەر چاوی خەیاڵمدا هەزار چەشنە خواردەمەنی ڕیزکرا! ئاو زایە دەممەوە بەری ئاخافتنی لێ گرتم، وایە ئومێد، مرۆ کە تریسکێکی لێ دەرکەوت بەشەوی شەوەزەنگ، بەخەیاڵ.. ئەخشی ئەوەندە وورد.. وورد.. دروست دەکا، کە پیاو بەچاوی ڕاستەقینە بەنیوەڕۆ بەدی ی ناکا! منیش کەوام دەزانی بەو پەنجا فلسە هەموو خواردەمەنی خۆش و بەتامی جیهانم هاتۆتە چنگ.. ئەوکاتە خۆم لەبەرزترین تۆپکەی کامەرانی دەدیت!!.

ئەگەر چی بەچاکی ئاگاداری چۆنێتی کاك مەحموود نەبووم وە نەم دەزانی لەچ بیرێك دایە، بەڵام سەرم لەوە سوڕمابوو، چۆن وەها زوو، لەشی سووك بوو بەشاقاوی بەرین و.. گورج.. گورج.. بەرێگاکەدا هەڵدەبەزیەوە؟!.

کە زەنگی قوتابخانە لێدرا، زۆر دڵخۆش بووم!! دڵ پڕ.. خۆم بەخۆمم دەگوت:

- هەرگیز.. برسی نیم، ئای چەند تێرم!!

وەبۆ ئەوەی بڕوا بەخۆم بکەم،



گورج قایشەکەی پشتم شل کردەوە!! کەبەیانی کونێکیم لێ گورج کردبوو و لەسەر زگمدا توندم کردبوو!! هیچ شتێك پەستی نەکردبووم کاك مەحموود نەبێت کە.. دەم لەدوای دەم لەناوەندی دەرسیش بوایە وای دەزانی زۆر بێ هۆشم! کە بەبێ لێکدانەوەو لەسەر خۆسەری دەخستە بناگوێم بۆ ئەوەی هەرجارە پێم بڵێ‌و لێم دووبارە بکاتەوە:

- ئایا.. ماوە؟!

بێ ئەوەی ئاگای لەوە بێ کەمن هەر لەبەیانییەوە دەستێکم لەو گیرفانەمدایە کە پەنجا فلسیەکەم تێ‌ی خستووەو هەزاران جۆرە یاری‌و هەڵپەڕکێم لەگەڵ کردووە!! جا.. ناچار، دەبوایە، هەرچەند دەقیقەیەك بە بناگوێیدا بچرپێنم..

- بەڵێ.. ماوە.

تا.. وای لێ هات هەراسان بووم جێگام نەبوو خۆمی تێدا بشارمەوە، وەبیری ئەوەم بۆ دەهات کە کۆشك و تەلاری ئومێدم بڕوخێنم.. لەڕکی کاکم.. و لەپێش چاوی ئەو پەنجاییەکە توند هەتا دەستم دەڕوا توند.. دوور تێ‌ی هەڵدەم!! بەتایبەتی کاتێك هەستم بەوە کرد کە لە ورچانی دووەم بەتیژی لەلایەن کاك مەحموودم چاودێری دەکرێم!! خۆ ئەگەر بهاتبا بەرەو چایخانە یان دووکانەکەی مەکتەب چووبام، ئەوا کاکە.. پێشی پێ دەگرتم و بەخۆشی‌یان ناخۆشی بەرەو پاش دەیگێڕامەوە. کەدەرسی سێ‌یەم لێدرا، ئای کە دەرسی فەلەکیات بوو.. هەرچەند مامۆستا خەریك بوو باسی ڕۆژو ئاسمان و زەمینمان بۆ بکا.. من ئاگام لە هیچ نەبوو!! دووشت نەبێ.. قوڕەی زگی برسیم‌و پەنجا فلسیەکەی خۆی لەگیرفانمدا مات دابوو.

سەردەمێك هۆشم هاتەوە بەر مامۆستا باسی پێکهاتنی زەوی و چۆنیەتی ڕاوەستانی‌ی بەهێزی (جاذبیە) ی بۆ دەگێڕاینەوە. بەڵام من هەر ئەوهام بۆ دەهات کە زەمین و ئاسمان هەمووی لە پەنجا فلسی پێك هاتووە، وە لەسەر پەنجا فلسی، بەهێزی پارە ڕاوەستاوە.

ڕۆژم لەلا ئەوەندەی پەنجا فلسیەکە پێ جوان و پرشنگدار و پڕسوود نەبوو. هەروەها ئەستێرە گەڕۆکەکانیش.

لەدەرسی چوارەم هەر چەندە مامۆستا باسی چەند بنکەیەکی ئەندازیاری‌بۆ دەکردین، شەرح و لێکۆڵینەوەی دەکردن، من هەر ئەوەندەم لەلاڕاست و ماقووڵ بوو کە بنکەی هەموو زانێ یەك هەر پارەبێ و پەنجا فلسی‌و هەر خواردەمەنی. لەپڕ مامۆستا کاك مەحموودی هەڵستاندە سەر تەختەی ڕەش، لەبەردەمی قوتابییەکانی پۆل ڕایگرت، پرسیارێکی لێ کرد، چاوەنواڕی ئەنجام و وەڵامدانەوەی‌لێ دەکرد، کە کاکم هەردوو چاوەکانی زەق کردنەوەو بەشێواوی و پەلە ووتی:

- پەنجا.. فلس!!

قوتابییەکان هەموویان لە پێکەنینا بەرەو پشت بوون، شین هەڵگەڕان، مامۆستاش بۆ دەماری نەگیرا؟ بۆ تووڕە نەبوو؟! دەستی بە ڕووی کاکم بەرز کردەوەو هەتا هێزی لەبەر بوو زللەیەکی لەبناگوێی دا، کاکە لە زەبری زللەکە ڕاچلەکی و وەکوو هاتبێتەوە هۆش خۆی، و هەستی بە تاوانێکی زۆر کردبێ بە هەنگاوی ئاڵۆز گەڕایەوە جێگاکەی لەتەنیشت مندا.

لێت ناشارمەوە کە بەڕاستی منیش پێکەنینم هات، جا نازانم پێکەنینەکەم بەکاك مەحموود و وەڵامەکەی و بەسەرهاتی ئەو کاتەی بوو، یان دەنگدانەوەی بیرو هەستی خۆشی ئەوە بوو کە پاش نیوسەعات خۆم لە چێشتخانەیەك دەدۆزمەوە.

بەڵام کە ئاوڕێکم لە کاکە دایەوەو دیم ئاو زابوە چاوەکانی و لالێوەکانی دەلەرزینەوە، ئەو هەستە خۆشەم بڵاوەی تێ کەوت.. دڵم سارد بۆوە، کە مامۆستاش پشتی لە ئێمە کرد، لەسەر خۆ بە بەزەییەوە بەبناگوێمدا چرپاند:

- برا خوا کەریمە، گریانی ناوێ.

دوو فرمێسك لەسەر ڕوومەتە گەرداویەکانی خزین.. لەسەر چەناگەی لێکیان دایەوەو.. تك.. تك ڕژانە سەر تەختەکەی بەردەمی.

ماوەیەك کڕی لووڵی داین، تاکاکە خوزییکی تاڵی‌ی قووت دایەوەو دانی بەخۆی داگرت، هێزی دایە خۆی، بەدەنگێکی نووساوتر لەبەیانی لێ‌ی پرسیم:

- ئەرێ.. دەرسی دووەم چیمان هەیە؟!

ئەوکاتە بۆم دەرکەوت کە گەیشتۆتە گەروو، خەریکە لێ‌ی دەڕژێ!! بەسستی دەستم بۆ کاك مەحموود درێژکرد، پەنجا فلسەکەم خستە ناو دەستی.

کاکە پێ‌ی گەش بۆوە،.و زەردەخەنەیەکی گرینۆکی لەسەر زار دیاری‌دا.. منیش هەستم بە هێمنیێك.. هێمنیەکی خۆش کرد، هەستم بەوەکرد کە بارێکی گەورەو گرانم لەسەر شانم لادا.

---

## چرای گوندەکەمان



-١-

شیرین ترین ئاواتی ئەوە بوو کە.. بخوێنێ.. بخوێنێ، چونکی لەوە بێ‌گومان بوو، کە خوێندەواری ڕێگای مرۆڤ لە ژیاندا ڕووناك ئەکاتەوە.

بەیانیان کە کولینگەکەی ئەنایە سەرشانی و بەرەو کارەکە ئەکەوتە ڕێ لە تەنیشت قوتابخانە بچکۆلەکەی گوند کە ناوی نابوو (چرای گوند) ئاوڕێکی دڵسۆزانەی ئەدایەوەو، ئاهێکی دوورو و درێژی هەڵئەکێشا.

لاوێکی ژیر و لە لای دانیشتوانی گوندەکەمان بەڕێز و خۆشەویست بوو. ئێمە هاوتەمەنەکانی کردبوومانە (سەردەستە) و بە کاکەلاو، ناومان ئەبرد.

ڕۆژێك لەناکاو لێمان بزر بوو کەلێنێکی فراوانی لە دڵی ئێمەو خەڵکی گوندەکە کردەوە؟! هەموومان پەرۆشیمان بوو.. بۆی، دایکە پیرەکەی ئەبێت کە بەهێمنی ئەیگوت:

- با.. لەتاریکی ڕزگاری بێت، دەبا ببێتە چرایێك نیشتمان ڕووناك بکاتەوە.

وا کاکەلاو چووە شار بۆ خوێندن، بەڕۆژ کاری ئەکرد و بەشەو خوێندن، تاکوو گەیشتە پلەی دانشگە هەر لە پێشەوە بوو، چەند

کۆسپ و تەگەرەی ئەهاتنە بەری، بەکۆشش لای ئەدان هەر، زاڵ و سەرکەوتوو بوو، تا ئەو ڕۆژەی لەشکری درندەی دوژمن هێرشی هێنایە سەرووڵات ئەو سەردەمەش کاکەلاو، ڕێگای بۆ ڕوون ببووەوە وە بەچاکی بەدیی ئەکرد، ئەو چرایەش کە بەهیوای ترووسکێك لە ڕووناکیەکەی بوو، خۆی ببووە یەکێك لە هەڵگرانی، بووە پێشڕەو بۆ گەل لە بەربەرەکانی دوژمنی زۆردار. تیپێکی لە هەڤاڵە هاوبیرەکانی دانشگە پێکهێناو دەستیان دایە چەك و چوونە ڕیزی خەبات، لە پێناوی ئازادیی نیشتماندا.

-٢-

زۆر بە ئارەزوو گوێم لەم چیرۆکەی، ڕەشەی برادەرم گرتبوو، وام بۆ ئەهات کەڕووداوەکانی بەشێکن لە ژیانمان، لەبەر ئەوە؛ زوو. زوو هانم ئەدا کە، بیگەیێنێتە ئەنجام، هەر کە ڕەشە هەستی بەمە کرد، لێی پرسیم:

- ڕەنگە لەدڵی خۆتا، بڕیارت دابێت کە ئەو کاکەلاوە بناسیت. وانی‌یە؟؟!!..

وەچاوی برین لەچاوما، بزەیێك لەسەر زاری پەیدا بوو، هەندێك لێم هاتە پێشەوە، دەستێکی لەسەر شانم داناو چەند جارێك ڕای هەژاندم!!.. نیشانەی کۆمەڵێك کامەرانی لەچاوەکانی دیاری ئەدا، ئەمەش ڕەوشتی کاکەڕەش بوو، لە دانشگەش، کە دڵخۆش بوایە واشانی ئەگرتم و ڕای ئەهەژاندمەوە.

ئەو کاتە تاریك و ڕونی بەیان بوو من و ڕەشە ئیشك گربووین، لەگەڵ تیپێك لە پێشمەرگە لەسەر لووتکە پڕ ناز و فیزەکەی هەڵگورد چاوەدێریی جوڵانەوەی دوژمنمان ئەکرد، وە وەکو ڕاهات بەم چەشنە سەربوردە خۆشەکانمان لەتەمەنی شەو ئەپچڕاند.

دەستی ڕەشەم گرت، بەسنگمەوە قرساندم نامە سەر دڵم، کۆمەڵێك بیرەوەری پاڵەپەستۆی مێشکم بوون شۆڕشێکی بەتین لە دەروونما گڕی سەند، بیرەوەری و یادکردنەوەی ئەو دیمەن و قەوماوە پڕ سام و ستەمانە کە دوژمن بەسەر وڵاتەکەمی هێنا بوو؟!!.. وەك برووسکە لەشمیان ئەتەزاند، وەکوو هەزاران سووژنی ئاگرین لە جەرگما ئەم دیوو ئەودیو ئەبوون؟ دیمەنی ساوایانی لەدایك بڕاو منداڵانی وڵاتەکەم کە وەبەر شیلکی گوللە تۆپ و بۆمبا سوتێنەرەکان کەوتن و لەژێر داروو پەردووی گوندە وێران کراوەکان ئەنجن.. ئەنجن.. بوون و خنکان؟!.. یادی هەڤاڵە شەهیدەکانم کە بە خوێن، بەرپەرچی دوژمنی هێرش هێنەریان کردو گیانیان کردە سوپەرو قەڵغان؟!.. ئەم هەموو بیرەوەری و دیمەن و یادگارانە لە دەروونما پەنگیان ئەخواردەوەو جنگڵیان ئەدا.. و ئەبوون بەقینێکی گەورە، ئەبوون بە تووڕەیێك کە بۆ ڕێی هەناسەم لەگەڵیا نووسا، وە پشیم لێ هەڕما، لەتاوان هەڵستامە سەرپێ، تفەنگەکەم نایە سەرشانم، کەوتمە هاتوچۆکردن بەدەوری ڕەشماڵەکەی هەڤاڵەکانی ترمان لە ناویا ئەهەسانەوە. بایێکی ساردی گەزێنەر، لە باکوور ئەهات و ئەیدا لە ڕوومان، ئاڵاکەی سەر ڕەشماڵەکەی ئەلەراندەوە. سەرم هەڵبڕی لە قووڵایی ئاسمان ڕامام، ئەستێرەکان، دوور و بەئاستەم بریسکەیان مابوو، ووردە.. ووردە لەدەریا شین و قووڵەکە نقوم ئەبوون، ئاوڕێکم لە ڕۆژهەڵات دایەوە شەفەق تازە ئەپشکووت، کوردستانی ئەو دیو دێهاتەکانی لاجان، مەرگەوەر، هێشتا تەمی بۆری تاریکی بەچاکی لەسەر ئەڕەوی‌بووەوە، چیا بەرزە سەرکەشەکانیش، وەکوو دێو.. دێوی زل.. زل، خێویان بەرەو ژوور ئەکشا، گۆلی (ورمێ) وەك چاوێکی گەورەی لێڵ لە ئاسمان ڕائەما، ڕۆژیش وەکو فرمێسکێکی خوێنین لەناویا قەتیس مابوو.. ڕەشەی برادەریشم لەولاوە وەستابوو چەنەگەی کردبووە سەر لوولەی تفەنگەکەی لەبەر خۆیەوە گۆرانی سەرکەوتنی ئەگوتەوە.

(١) بەرەبەیان پێش ڕۆژهەڵات.. کە هێشتا دونیا تاریکە، ئەگەر یەکێك لەسەر لووتکەی هەڵگورد سەیری گۆلی ورمێ بکات بەبینێ ڕۆژ لە ناویا وەکوو ئەو دیمەنەی سەرەوە دیارە.

# ئەو گورگەی.. یووسفی خوارد

شەوێکی تاریك بوو.. وەشەوان نەدەچوو! چرایەکان ئەوتیان لێ بڕابوو! گڵۆپەکان ئەکوژابوونەوە.. بەڵام.. ڕووناکیان نەدەدا!! دەنگی هەراو هۆریاییێکی بزر، هێمنی‌ی قووت دەدا.. لەناو هەرایەکە دەنگی ناڵەو ئازار دەبیسترا!.. مەکینەکان دەسووڕان، گەڕیان دەدا، بەڵام ڕۆناکیەکیان لێ پەیدا نەدەبوو!.

کابرا.. لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

- ئاهـ.. چ کابووسێکی گران و بەدقەڕە؟!.

هەوڵی دەدا پێڵوو لەسەر چاوەکانی لابدا.. دیسان هەوڵی دەدایەوە.. تینی دەدایە بەرخۆی، پێڵوەکان بەچاوەکانیەوە پەرچ کرابوون! بێ جەمسەر بوون، هەڵنەدەوەشانەوە!.

هەردوو دەستی‌ی هەڵبڕین، ئەوەندەی درێژی دەکردن، نەدەگەیشتنە چاوەکانی‌ی! دەستەکانی لە ناوجەرگەی ئەو تاریکاییەدا.. هەر درێژدەبوون.. وەك دوو ستوونی بێ دوایی.. درێژ دەبوون و.. هەڵدەکشان!.

کوێرانە سەری بەهەموولاییێك دا دەجووڵاندەوە، هەستی‌ی بۆ دەوروو بەری ڕادەگرت، هەر جەنجاڵەکەبوو، هێزی دەدایەوە خۆی، دەستەکانی ڕادەوەشاندنەوە.. پێڵوەکان بەسەر چاوەکانیەوە لەحیم کرابوون!!..

بیرێکی بۆ هات لەمێشکی دەنگی دەدایەوە:

- با.. پێڵوو لەسەر چاوی مانگ لابدەم، ڕووناکی لە مانگەوە بکێشم.

دەستەکانی پتر بۆ ئاسمان ڕایەڵ کردن، چاوەکانی گرانەتایان گرتبوو، لەناو پێڵوەکاندا، لەخۆدەچوون! تەوانای جووڵەیان نەمابوو!. گوێی ڕایەڵ کردن، بەوەڕەسی بەخۆی گوت:

- هەر.. بۆگەنی ئەیم.. و.. لەو مەیدانەدا.. ئەڕزم! لەشی نیوە مردوو بو، بەڵام سەری بەهەموو لادا.. دەجوولا! لەناو ئەشکەوتی مێشکی، دەنگێك بەرزدەبوەوە.. دەنگەکە هەتادەهات.. گەورەترو بەرزتر دەبوەوە.

دوو ستوونە درێژەکان.. هەر بەرەو ئاسمان دەکشان.. دوو دیواری ئەفسوونی‌ی سەختیان لێ پەیدا.. دەبوو! لەناو هەردوو دیوارەکەدا، ڕێگاییێکی.. باریك.. باریك، وەکوو داوە موو.. باریك، خەتی بەرەو ئاسمان کێشابوو! تروسکەییێکی کز، لەوسەری ڕێگایەکە.. سیس هەڵدەستاو لەقووڵایی مێشکی دووبارە دەبوەوە. دوو تارمایی بەڕێگا باریکەکەدا.. بەرەو تترووسکاییەکە دەخشین! هەتا پتر دەچوونە پێش، ترووسکاییەکە گەورەتر.. بەشەوق تر دەبوو.

تارماییێك بانگی کرد:

- خوێنی یووسفی کوڕم.. دەوێ!!.

تارمایی دووەم لووراندی:

- لووڕر.. لووڕر.. ڕر.. ڕر..

گورگەکە سندم کرا بوو هەر دەی لووراند:

- لوور.. لووو ڕڕر

یاقووب سێبەری ڕدێنەکەی بەسەر دیوارە ئەفسووناویەکان هەڵدەپەڕیەوە.. هەر بانگیشی دەکرد:

- خوێن.. کوڕەکەم!..

گورگەکە، دەی لووراند، لوولەییێکی ئەستووری لەبن هەنگی دەرکێشا! لوولە ئەستوورەکەی لێك کردەوە، کلکی لوولەکە لە خوارەوە، بەلووتی کابرا دەکەوت!.. کابرا

دەستی نەمابوون، کلکی لوولەکە لەسەر لووتی لابدا! بەزار فووی.. توند.. توندی دەکرد، لەگەڵ بای فووی زاری کلکە درێژەکە، دەلەرایەوە.. لادەچوو.. دەهەژایەوە، لەلووتی کابرا.. گیر دەبووەوە! کابرا.. لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

- ئەگەر بستێك، کورت کرابایەوە، لووتی ڕزگاری‌ی دەبوو! بەقەلسی ئاهێکی هەڵدەکێشا!

گورگەکە، لەسەرخۆ.. توومارەکەی دەپێچایەوە و بانگی دەکردەوە:

- لەناو گورگەکانی، ئەم دونیایەدا.. یەکێك دەمی بەخوێنی یووسف نەبوە!

وە دەیگوت:

- توومارەکە وای لێ نووسراوە!

لەگەڵ قسەکانی گورگەکە، کلکی توومارە درێژەکە وردە وردە لەسەر لووتی کابرا.. لادەچوو.

یاقووب.. گوتی:

- یانزە بنی ئادەم.. دیویانە دەمی گورگەکە بەخوێنی یووسف.. سوور بوە!

یانزە، دەنگ.. قسەکەی یاقووبیان دەگێڕایەوە.

یانزە بنی.. ئادەم

گورگەکە دەیپرسی:

- چۆن زانیتان، سوورایی دەمی گورگەکە.. خوێنی یووسف بوو؟!

گورگەکە.. پرسیەوە:

- ما ئەوەی سوور بێ، خوێنە؟!

یانزە دەنگەکە.. بانگیان کرد:

- سوورایی دەمی گورگەکە، خوێنی یووسف بو.. خوێنی برامان بوو!

گورگەکە.. پرسی‌ی:

- ما.. ڕەنگی خوێنی یووسف.. سوورە؟

یاقووب.. گووتی:

- نا.. نا.. سەوزە!

یانزە برایەکە، بەتەنگاوی.. بانگیان کرد:

- بابە

گورگەکە.. گوتی:

- ئەوان دەزانن، ڕەنگی خوێنی یووسف چۆنە.. ئەوان.. ئەوان دەزانن! یانزە برایەکە.. دەمیان کلیل درا!.

یاقووب، سەری لێ شێوابوو، هەر بەدەورەی خۆی‌دا، وەردەچەرخایەوە!.

گورگەکە.. گوتی:

- لەتووماری.. ڕۆژانەی گورگاندا، لەو ڕۆژەی یووسفی تێداتوایەوە، گورگی برسی، لەناو ئێمەدا.. نەبوە!.

گورگەکە.. گوتی:

- ئێمە ئەگەر برسی نەبین نادڕین!.

یاقووب بەدوودڵی.. پرسی:

- ئەدی، ئەو شاهیدانە؟!

گورگەکە.. گوتی:

- هەموویان، لەیەك ڕەگەوە ڕواون.. هەموویان نەوەی تۆن!

گورگەکە.. گوتی:

- کوڕ.. بڕا.. باب، بۆیەکدی بەشاهید ناچن!؟

گورگەکە.. گوتی:

- ئەمە.. یاساییکە، خۆتان.. داتان ناوە.

گورگەکە.. گوتی:

- ئێوە باوەڕی بەیەکتری.. بە باوك و براتان.. بەخۆتان ناکەن!.

یاقووب.. زمانی‌کلیل درا!.

ترووسکەکە هەتا دەهات گەورەتر دەبوو، شەوقی پتر دەبوو، ڕێگا باریکەکەی بەرین تر دەکرد. زەلامێك دەهات کەلەشی بنی ئادەم و سەلکی گورگ بوو!!

دەنگێك هەڵدەستا، بەدەنگی گورگەکە دەچوو دەی گوت:

- ئادەم زادە.. کەخۆی دەگۆڕی، سەلکی گورگێك بەکەلەشی خۆیەوە دەکا!!.

گورگەکە، ڕووی لەیاقووب دەکردو دەیگوتەوە:

- بەم ڕەنگە.. دەیەوێ، خۆی لەخۆی.. بشارێتەوە!! گورگەکە.. داوای دەکرد:

- دەبێ ئەم نەریتە بگۆڕێ، دەبێ بەرەواژ.. بکرێتەوە! دەنگێکی زەلام لەناو ترووسکاییەکە هەڵدەستا، دەبوە قاقاییکی گەورەو لەدونیایەکە.. دەنگی دەدایەوە:

- قاه.. قاه.. قاه.. وەبانگی دەکرد.. دەیپرسی:

- ئەدی ئەو گورگەی یووسفی خوارد؟

یاقووب دەمی کلیل درابوو، چاوەکانی لێڵ ببون، گلێنەکانیان وەك فرفرۆك دەسوورانەوە، کوێرانە.. ئەنگوستێکی بۆ گورگەکە درێژکرد!

گورگەکە کلکێکی ڕاوەشاند، کلکێکی توندی لەڕووی یاقووب گیرکرد! و لێ‌ی پرسی:

- قابیل و هابیل.. دەناسی؟

یاقووب ویستی وەڵام بداتەوە.. گورگەکە ڕێ‌ی پێ نەدا، و بانگی کردەوە:

- ئەدی مەسیح!

یاقووب ویستی دەم لێك بکاتەوە، گورگەکە، کلکێکی توندی وەك قامچی بەڕووی داکێشا.. و بانگی کردەوە:

- ئەدی.. ئەهریمەن؟

- ئەدی نێرۆن؟

- ئەدی هیتلەر؟

یاقووب.. ویستی دەم بجوڵێنێ، گورگەکە ڕێ‌ی نەداو بەگوێ‌دا لووراندی:

- خوێنی.. سوورەکانی ئەمریکا

- خوێنی.. ڕەشەکانی ئەفریقا

- خوێنی زەردەکانی ئاسیا..

وەبەتووڕەییەوە.. پرسی:

- خوێنی یووسفەکانی هیرۆشیما.. بەدەمی گورگەکانەوە بوو؟!

- خوێنی یووسفەکانی ڕۆژهەلات.. بەدەمی گورگەکانەوە بوو؟!

- خوێنی یووسفەکانی دەشت و چیایەکان، بەدەمی گورگەکانەوەبوو؟!

- خوێنی.. ڕۆژ و شەوەکان.. بەددانی گورگەکانەوە.. ڕژا؟

یاقووب دەمی لێك کردەوە، ویستی قسەیێك بکا،.

یازدە برایەکەش، دەمیان بەش کردەوە، ئامادەبوون، لاسایی باوکیان بکەنەوە!.

سەرمایێکی بەتین، هەڵی کرد، دونیای گەڕاندەوە چاخی بەستەڵەك! قسەکانی باوك و کوڕەکان، هەر لەناو دەمیانەوە مەیین، بوون بەسەهۆڵ، نەگەیشتنە دەروازەی زاریان!.

ترووسکەکە هەتا دەهات نزیك تر دەبووەوە، گەورەترو ڕۆشنتر دەبووە،

شەوێکی تاریك بوو گلۆپەکان وەك چاوی برسیەکان دەنایسان، بەڵام ڕوناکیان نەدەدا، دەنگی مەکینەکان شەوقی گلۆپەکانیان دەمژتن!.

سەرمایەکە، بەتاو.. بەناو ڕێگا باریکەکەدا، وەك تیر بەرەو شار دەهات، دەنگی مەکینەکانی دەکردن بەسەهۆڵ، کپی دەکردن.

ترووسکەکە.. کەم کەمە، گەورەتر و ڕۆشن تر دەبوو، شەوقەکەی لەپێلووی کابرا دووبەدەر دەبوون و لەگلێنەی چاوی‌ی دەچەقین! گلێنەکان دەکەوتنە گەوزدان، دەکەوتنەوە گەڕ و مل ملانێ.. پێلوەکانیان.. پێلوە، پەرچە پۆڵاینیەکانیان دەتەقاندن،. کابرا بەهەموو تین و توانای چاوەکانی زەق دەکردنەوە چاوی هەڵدەهێنانەوە،.

تیشکی ڕۆژ سەریان لە ڕۆژهەلات هەڵهێنابوو، تا چاو بڕدەکا بەملیۆن لەو تیشکانە بەقووڵایی



ئاسمانەکەوە هەڵدەچوون. چاوی هەڵگلۆفتن، تاپۆی شەوی رابوردووی لەبەر چاو قیت بوەوە! سەری هەڵبڕی، لەدوور دەنگێکی دەهاتە گوێ:

- دەیانگوت لەگرانییە گەورەکە، جەناوەرێك پەیدا ببو، لەشی بنی ئادەم و سەلکی گورگێکی پێوە بو!

بانگەکەی پێ سەیر نەبوو! دایکی.. لەسەردەمی منداڵیی حیقایەتی ئەو دەعبایەی بۆگێڕابوەوە.

ویستی لەژێر نوێنەکەی هەڵستێ، لەشی گران ببو، بیری بە وێنەیێکی دیکە، بەسترایەوە!

- ئەو گورگ و دڕندانەی، سەلکی بنی ئادەمیان پێوەبو!

- ئەو دڕندانەی سەلکی بنی ئادەمیان پێوەیە؟!

هەر بیری کردەوە، هەر بیری کردەوەو بیری کردەوە تاکو لەپڕ لەگەڵ خۆی بانگی کرد:

- وێنەکەی بەدیواری چایخانەکەی "مەلا عەولا" دا هەڵواسرابوو!

بەخۆی گۆتەوە:

- دەڵێن وێنەکە هی سەردەمی حەزرەتی سلێمانە.. سولێمانی حەکیم! هەموویان بنی ئادەمی.. ماقووڵ.. ماقووڵن! بەڵام گون و.. سمت و کلك و.. چوار پەلی دڕندەیان پێوەیە؟! وێنەکە، لەمێشکی.. لەدەروونی چاپ ببو!! مەلای چایچی بە خەڵکی چایخانەکەی.. دەگوت:

- حەزرەتی سولێمان.. ڕۆحم بەفیدای بێ، لەم دڕندانەش وەزیرو گزیرو.. قوماندان و کوێخا و..

میرزاشی دادەمەزراند! کابرا.. لەژێر تەوژمی ئەم هەمو شتەکابووسیانەی بەمێشکیەوە نووسابوون، لەشی گرانتر دەبوو، ئارەقەیێکی ڕەش و شینی دەکرد، لەگەڵ خۆیەوە دەیگوت:

- ئای.. چ.. کابووسێکی ڕەش و گرانە.. چ گۆمێکی لیخنە تێیدا نقووم.. بووم!!

تەکانی‌دەدایە خۆی، بەرکەوە خۆی لەناو جێگاکەی هەڵدەقەناند و دەی مرتاند:

- شەیتان، بەلەعنەت بێ نەعووزوو.. بیللا.

چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردەوە.. ئاوڕێکی لە دەورووو بەری خۆی‌دایەوە، چاوی لە ئاسۆی ڕۆژەلات چەقین، ڕۆژ بە ڕوویێکی گەش بەگوندەکەی پێ دەکەنی، شنەبای ئەو بەیانیە، داروباری ئەوناوەی دەلەراندەوە، رەوەیێك ئەسپ و جوانی، لە مێرگە سەوزەکەی بەرامبەر گوند، دەلەوەڕان، هەڵدەپەڕین جلیتبازیان دەکردا.. کەڵەگاییێکی نەقۆلا.. لەناو وەردەکەدا، دەی فڕماند.. پێ کۆڵی دەکرد، کونە لووتی بەل ببوون!!.. لیکاو لە لالغاوەکانی دەرژا!!..

کابرا، فێنکاییێك بەدڵیەوە نووسا، لەناو نوێنەکەی ڕاپەڕی.. و لەبەر خۆیەوە دەی مرتاند:

- پەککو.. کوڕە.. خۆ نوێژی بەیانیم.. دۆڕا.

---

# قووچکە

ئەوسەردەمە، ڕۆژ، هێشتا منداڵ بوو، تازە گاگۆڵەی ئەکرد، وە لەسەر کەوانی تاقی دەرگای دونیاکە نووسرابوو:

ئەم شارە هاوتەمەنی ڕۆژە.

واتا مێژوو هێشتا سەرو ڕیشی بەسەر دونیاکەدا نەگرتبوو.

حاکمی شارەکە فەرمانی دابوو، قووچکە گەورەکە دروست بکەن، بۆ نیشان‌دانی هێز و جەبەرووتی، بۆ نیشانەی بوون و وجوودی، کە لە ڕاستیشدا نەبوو، ئیتر ئەوەبوو، خەڵقەکە، لەوساوە دەستی پێ کرد، قووچکەکە دروست بکەن و

کەچی ڕۆژ، هات پیربێت، ڕووی لۆچاوی و زەرد بوو. مێژوش پشتی کۆماو ڕیشی ڕمێك درێژ بوو و سپی هەڵگەڕا، خەڵکەکەش وەك شارە مێروولە، ئەجووڵێنەوە، بەگورجی بەرد لەسەر بەرد دائەنێن قوچکەکە هێشتا دیوارەکانی تەواو نەبووە.

حاکمەکەش هەر بانگ ئەکات، زەبر ئەوەشێنێ چاوی ئەوەندەی دەریاییێك، زەق بووە، چاوێك چاوێك.. ئەم هەموو دونیایەی گرتۆتە خۆی، وورد و درشت لەناویا بەوەرەسی مەلە ئەکەن، پەل ئەکوتن و مەلە ئەکەن.

ژنەکە، کە چاوی بەمن کەوت، سووڕایەوە و منی دایە پشت خۆی.

لە پشتی‌یەوە دەرگاییێك ئەکرایەوە، و منی بانگ ئەکرد، دەرگای پشتی کرابوورەوە، لەناویا



دڕندەیێکی زەلام چاوی ئەبریسکانەوە، ئەشکەوتی دەمی لێك کردبووەوە.. ها.. ها.. ها..

دەنگی پێکەنینی ئەگەیشتە شارەکە، وەکوو هاشەی ڕەشەبا، و گرمەی هەوری بەهار لە دیواری قوچکەکە دەنگی ئەدایەوە.

چاوەکانی برووسکەبوون، خەڵکەکە لەگەڵ نەڕەی ئەو دڕندەیە، تێك قڕژ.. قڕژان، کەوتنە ئاویەك و بەپەلە پەل.. و گورج تر، بەردوداروو کەرەستەیان ئەبرد بۆ لای قووچکەکە.. وەستایەکان، دەستیان هەزار پەنجەی تری لێ ڕوابوو، بەهێزێکی ئەفسانەیی دیوارەکانی قووچکەکەیان هەڵئەنا..

ژنەکە، ڕووی تێ کردمەوە، ئاگر لە ڕوومەتی هەڵئەستا،.

چۆلەکەیێکی بەدەم ئەپچڕی، بە خوێنی چۆلەکەکە لێوەکانی سوور ئەکران.

زۆر برسیم بوو.. لەبەر گەرمایی ڕوومەتی ژنەکە دەروونم ئەکولا.

تینوەتی هەناسەی بڕیم..

ئا.. ئاو.. بانگم ئەکرد، دەمم بەش کردبووەوە. ژنەکە چۆلەکەکەی، فڕێ دایە ناو دەمم، بەڵام تینوەتیم ئەشکا.

گەرمایی مێشکمی پەنماند، لە تاوان خۆم هاویشتە سەر سنگی ژنەکە، لەسەر سنگە پان و بەرینەکە خۆم خست،

دەمم هەتا ئەهات پتر لێك بەش ئەبووەوە و تینووتر ئەبووم.

لەسەر سنگی ژنەکە، دووتیشکی سپی بەرەو ژوور هەڵقوڵین، تیشکەکان وەکو ستوون هەڵکشان و ڕووناکیان بەرەو ئاسمان ئەڕۆیشت، لەپاشان ئەیکرد بەباران، لەسەر خەلقەکە پرووشکەی ئەکرد، ئەبوو بە.. لێشاو.. لافاو.. قووچکەکەی ئەهەژاندەوە.. ئەم گوت ئێستاکە ئەی ڕووخێنێ ئەی ڕووخێنێ و لوولی ئەدا، کەچی تەنها خەڵکەکەی لوول داو گەلێکی هەڵ لووشی.

وەستایەکان لەسەر قووچکەکە، دەستە هەزار پەنجەیی‌یەکەیان، بەرەو ڕۆژ درێژکرد، دەستەکانیان هەر درێژئەبوون و پەنجەی پتر لێ ئەڕوان و گەورە ئەبوون

بەلەپ.. پەلاماری ڕۆژیان دا و ڕۆژیان گرتە ناو لەپیان، بەرەو خوار ڕایان کێشا.

من هەتا ئەهات تینووم ئەبوو، گەرووم ووشك ئەبوو، ئەمەویست بخنکێم، ئەفەسم لێ بڕا، گەورزم لەسەر سنگی ژنەکە ئەدا.. لەسەر سنگە پان و بەرینەکەی گەوزم ئەدا.

ژنەکە دەستێکی درێژکرد و منی گرتە خۆی لەسەر سنگی بەرزی کردمەوە. خستمیە ناو یەکێك لە سوولیە سپیە نورینەکان؛ قرساندمی بەسنگیەوە، بەهێز قرساندمی بەسنگیەوە، دەمم هەتا ئەهات ئەکرایەوە، بەش ئەبوورەوە.. و گەورە ئەبوو.. بانگم ئەکرد..

- تینوومە.. ئاو.. ئاو..

تا خستمە سەر یەکێك لەو سوولیە سپیانەی سەر سنگی ژنەکە، ستوونە تیشکەکەم قووت‌دا،.. هێمنییێکم بۆ پەیدا بوو، هەناسەم هاتەوە دۆخی خۆی.. هاتمەوە سەر وێنەی ئادەمزاد.. هاتمەوە سەر وێنەی جارانم.

دەستم لەسەر سنگی ژنەکە کوتا، هەستم بە خۆشیەکی زۆر کرد، خۆشییێکی تەنها لە منداڵیما هەستم پێ ئەکرد، کاتێك کە خۆم بە سەرسنگی دایکمەوە ئەقرساند و دەمم ئەنا بە مەمکی، مەمکیم ئەمژی، مەمکیم ئەگرتە ناو دەمم و ئەم مژت

لەوساوە کەووتمە خەونێکی‌خۆش، خەونێکی قووڵ، خۆم لەیاد چوو، خۆم وون کردو ئێستاش نازانم لەکوێم.

# خەڵکەکە

## چۆن بوون بە گا

داپیرەم.. گوتی:

– سواری چەرخ و فەلەك بووم.. بەتاقی ئاسمان هەڵچووم، تاکوو گەیشتمە پەڵە هەورەکان!!..

باسی ئەوسەردەمەی ئەکرد کە مێژوو هێشتا باسی نەکردووە چونکی ئەو سەردەمە مێژوو لەدایك نەبووبوو.

داپیرەم لەمێژوو کۆن ترە، نەك تەنیا لە مێژوو کۆن ترە.. بەشکەم مێژوو ئەو دروستی کردووە.

منی زۆر خۆش ئەویست، لەبەروە باسی ئەو سەردەمە دووڕوو قووڵەی بۆ ئەکردم!!

لێم پرسی:

بۆچ ئەوردەمە شتی وا هەبوو، وەکو فڕۆکەی ئیمڕۆ پێ ی بفڕی وەیا بەهۆیەوە لەشارێك بۆ شارێکی تر بەزوویی بگوازرێتەوە؟! داپیرەم پێ کەنی و ڕووە چورچ و لۆچاویەکەی تێ کردم و چاوەکزەکانی تێ بڕیم و گوتی:

- بەڵێ کوڕم، ئەو سەردەمە، هەموو ئەوشتانە هەبوون و پتریش کە لە عالەمی ئیمڕۆدا نەیان بینی بەڵام، ئادەمزاد خۆی تێك و پێکی داو دونیایەکەی ڕووخاند بەسەر خۆیا، بە جۆرێك کە ئەوەی هەی بوو وون بوو.. وە بەرەکانی دوای ئەوان هەتا دووهەزار ساڵ نەیانتوانی ئەوشتانەی لەوسەردەمە وونبوون بیدۆزنەوە، و ائێستا خەریکن هەندێ شتی ئەو کاتە ڕووخاوە ئەهێننەوە کایە.

- ئەی بۆچ وا تەفروتوونابوون؟! وەنیشانەیان نەما؟!.. کە ئەم پرسیارەم بە ڕووی داپیرەمدا.. لەوەڵاما گوتی:

- کوڕم.. ستەم، زۆرداری بووەهۆی تێك چوونی ئەو هەموو پێشکەوتنە یان و بەرزو بەرینە، براشکی لەبرا ئەکرد.. کوڕ باوکی ئەدا بەئەرزا، گەورە بچووکی ئەخوارد، بەهێز بێ هێز کۆمەی ڕزی بوو کرمی تێ کەوتبوو بۆنی دەرئەچوو بەلاداهات جا بێ گومان ئەنجامی ئەم جۆرە ژیانە هەر نەمان ئەبێت و ڕووخان.

داپیرەم کە هاتە ئێرەوە.. سەرێکی دانەواندوو لەبەر خۆیەوە بە بۆڵە گوتی:

- گوێ بگرە ڕووداوێکی سەیری ئەو سەردەمەت بۆ بگێڕمەوە: من هەموو لەشم کردبوو، بەگوێ.. کە داپیرەم دایە قسە:

- فەرماندەرەکەی ئەو دەورە، بە ئارەزووی میللەت ئەهاتبووە سەر کورسی فەرمان ڕەوایی.. بەشکەم بەزەبری چەك و بەزۆری و فێڵ و تەڵەکەبازی وەکوو مێردە زمە بەسەرلاشەی میللەتەکەوە نیشتبوو، هەناسەی لێ بڕیبوو، لەبەر ئەوە هەرگیز بڕوایی بە گەلەکەی نەئەکرد. تاوای لێ هات، ئەترسی لەهەموو خەڵکی دەورووبەریشی ئەکرد نا بەشکەم ئەترسی لە نزیك ترین کەسی خۆشی ئەکرد.. شەو لە خەو ڕائەپەڕی، خەونی بەوەوە ئەبینی کە خەڵکەکە، بیری خراپی بۆ ئەکەن و پلان دائەنێن بۆ لەناوبردنی.

لە ڕاستیشا وابوو.. بێگومان چۆن خۆی سەپاندبوو.. ئەبوایە واش لاچێ؟!!..

جاهەر بۆ ئەوەی گەلەکەی بەچاکی ئابڵوقەبدا، وەهەتا سەیری بکات، لەسەر هەریەکەی دووچاوی دانابوون، جووڵەو بزوتنەوەی خەڵکەکەیان ئەژمارد.

بەمەندەش ئەوەستا، فەرمانی دا کە هەموو خەڵکی شارەکەی کۆبکەنەوە و ناو نووسیان بکەن و هەریەکە مۆرێکیان بە باسکەوەبنێن بۆ ئەوەی بناسرێنەوە و چاوەدێری کردنیان ئاسان بێت.

خاڵ میکایلیش بێگومان یەکێك بوو لە مۆرکراوەکان. هەر لەبەر ئەوەی خاڵ مکایل.. مرۆیەکی پیر و دونیا دیتە بوو، وە چووبووە قووڵایی ئەمەنەوە، لەو مۆرکردنە یەکجار قەلس ببوو.

هەر لە ڕووی دڵناسکیەوە، کات لەدوای کات لەبەر خۆیەوە ئەیگوت:

- بەخوا قەت شتیوا نەبووە، مرۆ، مۆری دیلیەتی پێوە بنرێت وەکوو ئاژەڵ نیشان بکرێت وە ئەوەی هاتەوە یاد کە چۆن کاتی خۆی، کە تازە گەنج بوو، لەگەڵ باوکی ڕەحمەتی، ئەچووە جەڵەب کڕین، باوکی هەموو ئاژەڵەکەی ئەی کڕین بۆ جەڵەب هەروەکو "ئەوان و ئێستایان" مۆری ئەیەکردن، لەدواییشا دڵە ناسکەکەی ئەکولایەوە گوڵێك فرمیسکی ئەڕشت.

هەر خاڵ مکایلیش بوو کە بەتوندی، بەزمان و کردار.. بە ئاشکرا بەرهەڵستی ئەو مۆرکردنەو دیلیەی ئەکرد، کەچی خەڵکەکە هەرچەندە زۆریان هەروەکو خاڵ مکایل بیریان ئەکردەوە، بەڵام هەر بیرکردنەوە بوو.. و نارەزاییەکەیان لەچواچێوەی مێشکیان ناهاتە دەرەوە. جا هەندێك لە ترسا و هەندێکی تر لەبەر بێدەسەڵاتی، و بەشی زۆریشیان هەر لەبەر ئەوە کە، نارەزوویان نەئەکرد، ئەو پێنج و دوو ڕۆژە ژیانەیان شێلوو بکەن و تاڵی بکەن وبیشڵەقێنن وخۆیان بخەنە بەر زەبر و زەنگی فەرمانبەر و قەمچی بەدەستەکانی.

سەفەرێکییان مام مکاییل بۆ کارێك لە ماڵ هاتە دەرەوە "چونکە ئەم مەگەر ڕۆژێکی وا بە ناچاری ئەبوایە هەر لەماڵ نەئەهاتە دەرەوە، وە بەشارەکەدا بەدوای کارێکی گرنگی خۆیدا چوو.. هەرچەند هەنگاوێکی ئەهاویشت جارێك ئەیان پشکنی و باسکیان ڕووت ئەکرد و مۆرەکەیان بەسەر ئەکردەوەتا خاڵ مکاییل لەگیانی خۆی وەڕەس بوو، ئیتر باسکی کرد و لە ئۆتۆمۆبیل هێنایە دەرەوە و وەکوو داری ئاڵا، لەجامی ئۆتۆمبیلەکە بەرەو شەقام بەرزی کردەوە.

بەڕێکەوت، لەشەقامێك تێ ئەپەڕی کەوا فەرماندەرە کە خۆی ئەوکاتە لەوێوە وەستابوو، کەچاوی بەخاڵ مکاییل کەوت بەمجۆرە، زۆر ڕکی هەڵستاو چاوی چوونە تەوقی سەری، وە وای ژمارد کە خەڵکەکە گاڵتە بەفەرمانەکەی ئەکەن.

بانگی سەرۆك داروغانی کرد کە خاڵ مکایل دابەزێنن. کە خاڵۆیان بردە بەردەمی فەرمان ڕەوا لێ ی پرسی:

ئەوە بۆچ دەستت لەجامی ئۆتۆمۆبیلەکە درێژکردۆتەدەرێ، ئایا گاڵتەت بە کردەوەی من دێت وەیاچی..؟!

خاڵ مکاییل لەوەڵاما گوتی:

- قوربان.. ئەمە بۆ گاڵتە نی یەو شکاندنی فەرمانی تۆش نی یە، بەشکەم سەرچەماندنە بۆ فەرمانت، وەبۆیێ باسکم وا ڕووت کردووە داروغانەکان ماندوو نەبن بە پرسیار و وەڵام و بەزوویی مۆرەکەی دەستم بەدی بکەن.

حاکم بە وەڵامەکەی خاڵ مکاییل ڕازی نەبوو بە توڕەیی پێ ی گوت:

- نەخێر.. وانی یە، تۆدیارە پیاوێکی چەتوون و بڵحی، لە فەرمانی من یاخی ئەبێت!!

خاڵ مکاییل نەختێك گوێ ی گران بوون.. لەبەر ئەوە یەکەم جار لەوروتەکەی حاکم حاڵی نەبوو.. بۆیێ لە خەڵکەکەی پرسی:

- ئەرێ ئەوە پاشا چ شەکر ئەشکێنێ؟!!..

کە چوونیەتە کە تێ گەیشت دەنگی بەرز کردەوەو ڕووە پاشا گوتی:

- گەورەم گوێ بگرە لەم سەربوردە کە بۆت ئەگێڕمەوە.. پێویستیش بەتووڕە بوون و زۆریش ناکات.. خۆ هەر پشتی ئێمە بووە و داری تۆ.. کەس توانای نەبووە لەوەی تۆ ویستت چەند و چۆنی بکات.. جا تۆش چ ئەفەرمووی ئەوە دارەکەت لەدەستە. ئیتر خاڵ مکایل وا دەستی بە چیرۆکەکەی کرد:

- قوربان ئێمەی جووتیار.. گامان زۆر خۆش ئەوێت بەتایبەتی کە هێشتا جوانە گایە، و لەسەر هێز و تاقەتی خۆیەتی.. چونکی ئاشکرایە کە گاجوت زۆر شت ئەگەیەنێ بۆ ئێمەی فەلاح. زەوی پێ ئەکێڵین، چێڵی لێ چا ئەکەین. (ئەوە ئەگەر ڕەسەن بێت) وە لە پێویستیا باریشی ئەکەین و کارو کرداری تریشی پێ ئەکەین..

گا.. لەگەڵ زەوی لێك بەستراوەتەوە.. زەویش هەموو شتێکی ئێمەی جوتیارە، واتا ژیانمان وابەستەی زەوی و گاجوتە، بۆیێ حسابی زۆر بۆ گاجووت ئەکەین، خۆراکی باشی ئەدەینێ لە جێگای پاك پەروەردەی ئەکەین، تاوای لێ دێت وەکوو یەکێك لەگەسانی خێزانا سەیری ئەکەین!! وە دائیما هەوڵ ئەدەین کە قەڵەو و بەتین بێت تا بێگاری جووت و کارمان بەچاکی بگەیەنێت.. لەکێڵان و دروونەو کوتانەوەی دەغڵودان

ئەوە.. هەتا جوانە و لەسەرهێزە، خۆکە پیریش بوو.. ئەوا هەر سەبارەت بەوەی مافێکی زۆری بەسەرمانەوە بووە، دڵمان نایەت سەری ببڕین و ئیتر ئەیبەین گوند بەگوند ئەیگێڕین تا لەگوندێك ئەیفرۆشین، کابرای کڕیاریش ئیتر کەیفی خۆیەتی چی لێ ئەکات هەرلەبەر چاوی ئێمە نەبێت.. بەسە.

جا ئێستا وا گایەکەمان پیربووە، خاوەنەکەی ئەگاتە هەر دێیەك خەڵکەکە لێی کۆئەبنەوە، سەودای ئەکەن، ئەم سەیری لات و لەتەری ئەکات ئەویان دەستی ئەکوتن لە سمت و پشتیا.. ئەوی تریان سەیری سەروگوێلاکی ئەکات.. ئەمجا دێتە سەر ئەوەی لەتەمەنی شارەزایی پەیدابکەن.. و دەمی لێك ئەکەنەوە تاسەیری دەم و ددانی بکەن.

مەعلوومی گەورەییتانە.. گا.. بەئاسانی دەمی لێك ناکرێتەوە.. ناچار بەشەش حەوت زەلام ئەیگرن و ئەیدەن بە ئەرزا و بەهێز و بە زۆری دەمی لێك وااڵئەکەن.. ئیمجا ئەیکڕن.. یا..نا، ئەم سەودایە وا ئەبێت.. گای.. بەستەزمانیش ئە دێیەك.. تا دوو.. ئەکڕیارێك ئە پێنج ئەمەندە ئازار ئەدرێت تاوای لێ دێت، هەر زەلامێك ببینێ گورج دەمی بەش ئەکاتەوە.. جا با ئەو زەلامە کڕیاریش نەبێت.

خاڵ مکاییل کە ئەم سەربوردەی ئەگێڕایەوە حاکم و دەست و پێوەندی بەرك و واق وورماوی سەیری دەمیان ئەکرد، کە لە سەکانی بووەوە فەمانبەرەکە لێی پرسی:

- ئێ.. ئەمجا.. دوایی چی بوو؟!..

خاڵ مکاییل گوتی:

- قوربان هەر ئەمەندە بوو، چیرۆکەکە!!.. مەبەستەکەشی وەڵامی پرسیارەکەت ئەداتەوە.. کە هەوەڵ جار بەڕووت دادام.. کە بۆچی باسکت وا ڕووت کردووەو لەجامی ئۆتۆمبیلەکەت هێناوەتە دەرێ؟!.. ئێمەش وەکوو گاپیرەمان لێهاتووە، ئەوەندە ئازارمان دیت لە پشکنین و مۆر بەسەر کردنەوەی باسکمان، تا وامان لێهات کە وەکوو گاپیر لەگیانی خۆمان وەرس بین و ئەو دەمی بەش ئەکردەوە.. ئێمەش مۆری باسکمان!.. تا پیاوەکانت بەبێ گرێ و چەندو چۆنی، بێ پرس و لەکوێ و بۆکوێ بزانن ئێمە چین و لە بەندەکانی پاشای گەورەین.

فەرمانددەرەکە.. نەیهێشت خاڵ مکاییل قسەکەی تەواو بکات بەقینەوە گوتی:

- حەگ ه.. چەند پیاوێکی زۆربڵێی.. خۆزیا گا ئەبوویت تا چەقۆیێکم لەزمانت بنایتایەوە.

خاڵ مکایلیش گوتی:

- گەورەم هەروەکو عەرزم کردی.. ئێمە خەڵکەکەی.. بەندەکانی تۆ.. لەسایەی داروغە و دەست و پێ و قەمچی بەدەستانت، جیاوازیەکمان لەگەڵ گای جووتیارەکە نییە!!. مەگەر لەو ڕووەوە نەبێت کە جووتیار تاگایەکە پیرئەبێت ڕێزی لێ ئەنێ و خۆراکی باشی پێ ئەدات.. کەچی ئێمە.. هەر لە یەکەم ڕۆژەوە.. ڕێزمان شکاوە ونی یەو.

خۆراکیشمان، بەشی زۆری ئەبێ بەخەرج و باج.. واتا.. خۆزگەمان بەگای جووتیارەکە.

## لەسەر شانۆ

مامۆستا پیتۆڵ خۆی بەزانا و ئەدیب و ژیرێکی وا ئەزانی کە پێویست بێ جێگاییێکی تایبەتی لە لاپەڕەی مێژوو بۆ تەرخان بکرێ و جێگاییێکی گرنگیش لە کۆمەڵەکەی! هەموو بیرو باوەڕی وابوو کە ئەو بیروزانیاری‌و تێگەیشتنەی ئەو هەیەتی و ئەیزانێ هەرگیز یەکێکی تری وەکو خۆی ئەبووەو نی‌یەو ناش بێت. جارجار کەسەری هەڵنەبڕی و سەیرێکی کتێبخانەکەی ئەکردو دەستی درێژ ئەکرد کتێبێکی دەرئەهێناو پەڕپەڕ وەری ئەگێڕاو هەندێ ڕستەو سەرەدێری لێ ئەخوێندنەوە، جۆرە کامەرانی و خۆشی‌یەکی وای بۆ پەیدا ئەبوو کە لەگەڵیا خۆی لە بیرئەکرد، خۆ ئەگەر بهاتایەو ئەو کتێبەی یەکێك با لە چیرۆکە تەمسیلی‌یە دانراوەکانی خۆی هەر خۆی ئەبوو بەهەموو ئەندام‌و کەسەکانی ئەو چیرۆکەو دەوری هەموویانی وەرئەگرت، جارێك ئەبوو بەژن، جارێك بەمنداڵ جارێك بە پیرەمێرد و پڕ بەدەم ئەیکرد بە هەراو هاوارو قیژە بەتایبەتی کە دەوری فەرماندەییێکی سوپایی ئەخۆندەوە، بەنەڕە نەڕ و فەرمان دانێ هەموو خێزانەکەی بەسەر خۆیا کۆ ئەکردەوەو لە دوایشدا ئاخێکی هەڵئەکێشاو لەبەر خۆیەوە ئەیگوت:

- ئاخ چبکەم ئەگەر ئەهات و من (دە) کەس ئەبووم ئەوسا دیاری ئەدا کە ئەم چیرۆکە لەوانەیە کە شایانی تەمسیل کردن بێت لەسەر هەرە بەرز و بەناوبانگ ترین شانۆکانی جیهان. گەلێك شەوانیش وارێك ئەکەوت کە مامۆستا پیتۆڵ لە ژێر نوێنەکەی ڕاپەڕێ، چاو زەقەو دەمار کشت‌و پەشێوو بەهەمو هێزی هانگی ئەکردە ژنە بەستەزمانەکەی کە هەر لە ژوورەکەی ئەم ئەخەوت:

- "پەریزاد.. پەریزاد ئافرەت هەڵسە گوێ لەم شیعرە وەیاچیرۆکە بگرە کە دام ناوە" وە لەگەڵ ئەو هاوار و گرەیە خێزانەکەی هەموو لە خەوی شیرین ڕائەچڵەکاند، ئافرەتەش. سەری لەژێر لێفەکەی ئەهێنایە دەرەوەو دوو لێوی لێ مووچ و شۆڕ ئەکردن‌و بە ساردی گەشکێکی بە مامۆستای مێردی ئەگرت‌و سەری ئەخستەوە ژێر نوێنەکەی.

مامۆستا بەو بۆنەیەوە کە ئامۆزای سەرۆکی شارەوانی شارەکە بوو هەر چیرۆکێکی دای ئەنا هەرچەندە بێ‌تام و بێ ئامانج و ئارێك و مێشك و چیکڵدانە تێکدەریش بوایە چار ناچار بە زۆری ئەدران بەسەرو گوڵاك و دەمارو چاوی خەڵکی شار، کار هەڵسوورێنەری تاکە شانۆکەی شاریش توانای ئەوەی نەبوو کە چ دەنگێك بەرز بکاتەوە وەیا بەگوێی مامۆستای بەرێز بچرپێنێ کە ئەو چیرۆکانەی بۆ شانۆ دەست نادەن، چونکی تووڕەبوونی ئەم‌و نان بڕانی ئەو بەیەکەوە بەسترابوون، هەروا دانیشتوانی شاریش ئارەزوی ئەوەیان ئەکرد کە دڵی سەرۆکی شارەوانی بیەشێن و لەخۆیانی زویر بکەن‌و پێوەندی باشیان لەگەڵیا هەڵوەشێنن، ئەش توانم بڵێم کە بەشێکی زۆری خەڵکەکەش لەڕێگای بەرەڵایی‌یەوە هەر بۆ ئەوەی کات بکوژن‌و مێشك ماندوو بکەن، وەیا بۆ خەوهاتن ئەچوونە شانۆکە. بە کورتی کەسێ نەبوو لەو شارەدا کەشانۆکە پاك بکاتەوە وە یادەستێك بە ڕووی مامۆستا پیتۆڵەوە بنێت بۆ ئەوەی بەرەنگێك تێی بگەێنن کە ئەوە نی‌یە کە خۆی حسابی بۆ ئەکات مەگەر پەریزادی ژنی!! کە زۆر جارو هەر کە هەلی چەنگ بکەوتایە بە گاڵتەو تیز لەگەڵی ئەدوا و بە تەوژم هێرشی ئەهێنایە سەر خۆی و چیرۆکەکانی، وە کە ئارەزووی پەست کردن‌و تووڕە کردنی ببوایە، کاتی نوستن بەچاوێکی پڕ قەشمەری تەماشاییێکی مێردەکەی ئەکردو بە تەوسەوە پێ‌ی ئەگوت:

- مێردە خۆشەویستەکەم، هۆ مامۆستای مەزن، ئەی فەیلەسووفی ئەقۆڵاو قارەمانی ئەبەز! ه ئا.. بەرێکی بەتام و شیرینی بیری ڕۆشن و مێشکی ئۆتۆمیتم پێ ببەخشە، چیرۆکێك یان شیعرێکی خۆتم بۆ بخوێنەوە تا پێ‌ی بخەوم‌و بچمە عالەمێکی سیحری!!

ئەو ئێوارەیە مامۆستای پیتۆڵ، خێرا خێرا و بەلووت بەرزی لەسەر لێواری شانۆکە هاتوو چۆی ئەکرد و بە فیزەوە سەیری بزووتنەوەی خەڵکی شاری ئەکرد کە پۆل پۆل بەرەو شانۆکە ئەهاتن بۆ دیدەنی چیرۆکە نوێیەکەی مامۆستا کە وەکو ڕاهات ناوبانگێکی زۆری پێ درابوو!! وە پڕۆپاگەندەییێکی تەواوی بۆ کرابوو، دیار بوو ئەو ڕۆژە خەڵکێکی زۆر لە هۆڵە بەرینەکەی شانۆکەدا کۆبووبوونەوە. لە ڕیزی پێشەوە دوو کورسی تەنیا بۆ مامۆستا دانرابوون، خۆی لەسەر یەکێکیان دانیشتبوو ئەوی‌تریان هەروا بەچۆڵی مابووەوە، وا دەرئەکەوت کە بۆ کەسێکی نزیك و خۆشەویستی مامۆستا دانرا بوو.

مامۆستا دەمنادەم ئاوڕێکی لە پاش خــۆی ئەدایــەوەو کــە چــاوی بەتەماشاکەران ئەکەوت هەوەسێکی وای بۆ ئەهات کە لە گەڵیا بزەیێك لەســەر زاریــا پــەیدا ئــەبوو.. کــە ڕووناکی کوژایەوەو پەردە لادرا لــە دیمەنەکــە دوو کــەس نیشــان دران، یەکێکیان ئەستووروو قەڵەو قوتەبنەو ئەوی تریــان بــاریك و لاوازو درێــژ، هەردووکیان لە تــەوقی ســەریانەوە زرێ پــۆش بــوون و چەکمــە لــەپێ، وەکــو ســـوارەکانی چاخـــەکانی ناوەڕاســت ئەهاتنــە پێــش چــاو، هەریەکە شمشێرێکی فافۆنیان بە دەســتەوە بــوو، هــەر یەکــەیان سێلێکی وەکو قــەڵغان لــەخۆ قــایم کردبوو، هەریەکەیان بە خۆی و باب و باپیری خۆی هەڵئەگوت:

یەکەم

منم پیتۆڵی ئەم چاخە!!
من سەرسەخترم لە ئەم شاخە!
منم ڕۆستەم بەزێێ
کەللە تەزێن
دونیا لەرزێن
بومەلەرزە کە ئەم بینێ
لەرکان دۆش دائەمێنێ!

دووەم

وا دیارە تۆ من ناناسی؟
وڕی بێ ئەقڵی زۆر کاسی
ئەگە خۆت پێ بناسێنم
بە یەکجار وات ئەتاسێنم
ڕۆستەمت لە بیر ئەچوێنم!
من پاڵەوانی زەمانەم
خاوەنی ئاوێنەو شانەم
منم هەر کاتێ دەر کەوم
لەپێ بلکەی ماڵ سەرکەوم
مشك و پشیلە و زیندەوار
ئەکەونە داد ڕۆ ڕۆو هاوار
تالە دەستم ئەبێ! ڕزگار
کە بەسەریان بنەڕێنم
هەموو گەڕەك ئەشڵەقێنم
خانویان بەسەر ئەڕمێنم
لەترسا هەورەکەی بەهار
دەنگی ئەنووسێ و شەرمەزار

یەکەم

قوڕ بەسەر، مشك و ماری چی؟!
کوندەو هەمبانەی پاری چی!
گەرببینی دەست و بازووم
گەر لە بۆت ئاشکراکەم ڕووم
لەتاو بریسکەی چاوانم
"هەی باوانم هەی باوانم"
ئاگر لەلاشەت بەر ئەبێ
لە زەمین بورکان دەر ئەبێ
هەموو زەوی ئاگر ئەدەم
گشت سەردارێك بێ سەر ئەبێ

دووەم

ئەوانەی تۆ هەمووی بایە
بایێك لەهەمبانە دایە

بەڵام من من من هەر
کلاوەکەی سەرخەجنم
ئەو بایەی من ئەیکەم بەفوو
ئەو فووەی من بیکەم بەتوو
کە دارستانێك ڕائەنێ
کەشارستانێك هەڵئەقەنێ
پووشکەییێکی وەکو تۆ سووك
لەوبەر دنیا بە نووکە نووك
ئەتهاوێتە دنیای ئەبوون
ئەڕۆی ئەڕۆی بێ سەرشۆن

یەکەم

باوك و باپیرانی من بوون
ئەم شار ئەوشار بەپێ ئەچوون
هەتا گەیشتنە ڕۆخ دنیا
دونیایان لە ژێر پێی خۆنا
ئنجا بەرەش ئەوەستان بەس
چوونە ئاسمانیش بەهەوەس!
سواری هەمبانە ئەبوون
کە ڕۆژ ئەوانی چاو پێ کەوت
هەڵئەنگوت و دەماو دەم کەوت
بەزەیی‌یان هات بەرۆژا
ئەوە بوو ئیتر لەو.. ڕۆژە
پاشە پاش بۆی کشانەوە
هەمبانەیان فشانەوە
دەسا تۆ هەوی یانە من
تۆ ئاغای زەوی یانە من؟!

دووەم

ئەوانەی تۆ کاوێژت کرد
هەمووی باوکی من بوو ئەیکرد
ئەو دایهێنا یەکەم هەمبان
یەکەم کەس بوو چوو بۆ ئاسمان
لەهەموانیش زۆرتر ماوە
تا ئێستاش وا لە سەماوە
هەر من ئەوەی ئەو باپیرەم
هەر من گوڵکی ئەو گاپیرەم؟!

یەکەم

نا.. من گوڵکی ئەو گاپیرەم

دووەم

نا.. من گوڵکی ئەو گاپیرەم
با دەس ئەکەمە ئەم شیرەم
شەقەو پەقت کەم وەك شووتی
بتکەم بە برمووتی لووتی
بۆ باپیرت بت نێرمەوە
تاوەهۆش خۆی بهێنمەوە!

یەکەم

هۆشت بێنەرە سەر باشە
دەنا واللاهی لە پاشا
تەراش بێ من ئەڵێم ئاشە!
شیرەکەی تۆ کەینێ شیرە
وەك نان برنشکەی داپیرە
کەی پۆڵای وەك من ئەبڕێ
وای شێتە شەڕ بۆ خۆی ئەکڕێ

- نا.. منم.. من
- نا.. من.. منم

هەر لە سەر ئــەم شێوەیە بــۆی ئەڕێسن، تاکو لێك هەڵئەقۆزنــەوەو دەست ئەدەنە شێرو قەڵغانەکانیان و تا ماندوو ئــەبن و دێنــەوە ســەرێ هەڵگۆتنی خۆیان. سوێند بەخێوی باوو باپیر خواردنیان هــەر لەیەکەم دیمـــــــەنی بەشـــــــێکی زۆر لەتەماشاکــەران دەســتیان کــرد بــە پێکــەنێ و هــەڵلا هــەڵلاو فیکــە کێشان. هۆڵە بەرینەکە لە دەنگی کەڵەشێر و پشیلە و گاجووت و زۆر جۆرە ئاژەڵێکی تر پەنگاوە.

مامۆستا پیتــۆڵ لــە جێگاکــەی هەڵســـاو نــەختێ خــۆی لەقانــەو لەپاشــا چــووە ســـەر کورســیەکەی ڕاوەستا، بە شانازییێکەوە سەیرێکی تەماشــاکەرانی‌کردو لــە جێگاکــەی دانیشتەوە و لەبەر خۆیەوە ووتی:

- ئەمەیـــە شـــانازی، ئەمەیـــە جاویدانی و ئەمری، ئەمەیە خزمەت بۆ گەل، ئەمەیە فەن و هونەر.. لە پڕ ڕوانیە کورسیە چۆڵەکەی تەنیشتی و بە زوێری کەوتە مرتە:

- ئای ئافرەت هەر ئێوەن بوونەتە هــۆی ئــازار و ئالــەباری زۆر تریــن فەیلەسوف و گــەورەکانی جیهان. بــەڵێ ئــەوە ئــەفلاتون گــەلێك شــەو ژنەکــەی دەرگـــای مـــاڵی لێ نـــە ئەکردەوە و تابەیانی بــە کەساسی لــە نــاو کۆڵانــان ئەســوڕایەوە، ئــەوا تۆلستۆی لە کاتی گیانا لایدا لەناو ماڵ منداڵی لەدەس ژنەکەی سەری هــەڵگرت و هــەڵات.. بــەڵێ هــەر ئافرەتە ئەبێتە هۆی ئازار و شکانی پیاو!!

لەپاش کەمێ وەستان دەستی بە مرتە کردەوەو لە خۆی پرسی:

- بــەڵام.. ئایــا هــەر ئــافرەتیش نی‌یە بوەتە هۆی ئیلهام و بــەهرەی ئەو گەورە پیاوانە؟! بەڵێ.. بەڵێ لە سنووری ژیــانی هــەموو گــەورەو هونەرمەندێك، ئافرەتێك هەیە!!

"وا وەڵامی پرسیارەکەی خــۆی ئەدایــەوە" وە بەدڵشــکاوی و بــە پەرۆشەوە خۆی بەخۆی گوت:

- لە بەدبەختی منە کە ئــافرەتی ژیانی من، ئەم ژنە، ئەم پەیزادەیە!! کە هیچ ڕێزی ئازانی و حساب بــۆ گەورەیی و زانایی ناکــات و هــەندە زاڵــە لەســـەریی وای کــردوە کــە بەتەواوی لێی بترسێت.. ئــەو ڕۆژە لەسەر گەردانــەی تــازە چــی کــرد!؟ ئەو کاری چی‌یە من هەیکەلم ئاڕێك و جلــەکانم هــەموو ڕۆژ ئوتــوو نــاکرێن! ئــەوە پێویســتە لەســــەر هێلکەیێك.. شکانی بەرداخێك بیکا بەهەرا. تاخۆی وا ئیقناع کرد کە.

- پێویســتە منیــش وەك هۆگــۆ پۆشــکین وەك شــیللی، شــۆپان ئافرەتێکی وام بێتە ڕێگا کە ببێتە هــۆی ئیلهامو بــەهرەمو بۆ ئــەوەی



ڕێگام بۆ دیارو ڕوون بکاتەوە بەرەو گەورەیی و ئەمری.
مامۆستا پیتۆل هەر لەم خەیاڵانەدا بوو کە چووە خەوێکی قووڵ خەونی بە ئافرەتێکی ژیانیەوە ئەبینی کە ئەبێ چۆن ئافرەتێک بێ؟! وە لەوانەیە خەیاڵی کردبێت کە ئەشێت ئەو ئافرەتە یەکێک بێت لەوانەی کە لەم شانۆیەدا سەیری ئەم چیرۆکە بەرزو پڕ هونەرەی ئەکەن؟! خەڵکەکە وورده وورده بە گاڵتەوە قەشمەرچاری ئەکشانەوەو هۆڵەکەیان چۆڵ ئەکردو تا سەردەمێك کە مامۆستا لە خەوی شیرین هەستا هیچ کەسێك لەشانۆکەدا نەمابوو.. جگە لەدوو کۆنەسوارەکان. هەرکە ئاوڕێکی لەدواوەی دایەوە بۆ ئەوەی چاوی بە ئافرەتێکی خەیاڵی بکەوێ سەری لەوە سوڕما کە لەخۆی بەولاوە چاوی بە چ گیانلەبەرێك نەکەوت لە هۆڵەکەدا. رووی وەرگێڕایەوە لای شانۆ هێشتا دوو زرێدارەکە لەسەر شانۆ ئەهاتن و ئەچوون و ئەڕەیان ئەهات:

-منم هەر من

ئەوی تریان لێ وەرئەگرتەوە

-منم هەر من

وەشیرە فاقۆنەکانیان لە یێك هەڵکێشابوو، هەر یەکە بە باوکو باپیری خۆی هەڵئەگوت.

مامۆستای بەڕێز ئەو قەوماوەی زۆر لاگران هات و پێی ناڕەحەت بوو زۆری لێك دایەوەو هەموو بیرێکی کرد کە بووبێتە هۆی چۆڵ کردنی شانۆکە لە لایەن تەماشاکەرانەوە، تەنیا بیری ئەوەنەبێت، کە خەڵکەکە ئارەزووی ئەوەیان کردبێت کە مامۆستای خۆشەویستو مەزن لە خەونەکە نەکەن و بەهێمنی و بێ هەست بکشێنەوە.

## شەوی.. هەزار و دووەم

مرۆ، بۆ خوا بڵێ.. شاهیدی لە ئیمانە، حاجی شێخ مەلا عبدالقدووسی قازی شاری جابولقا، کە دواچەکەرەی.. بنەماڵەی شێخ قوتبە الدینی، خاوەنی دین و دونیای سەردەمی خۆی بوو، پیاوێکی.. ڕاست گۆ.. و ڕاست ڕۆ بوو. زۆرجار لەگەڵ خۆیدا دەیگوت:

- بۆ کێ، خۆم بگۆڕم، هەتاکەی ڕاستیی لەم خەڵکە بشارمەوە؟ سەبارەت بەچی.. خۆم شەرمەزاری دونیاو قیامەت بکەم؟!.

ئەوە بوو، لە دواییدا بڕیاریدا خودای خۆی ڕازی بکاو ویژدانیی بەهەسێنێتەوە، هەروا باری ئازاری قەبریش لەسەر باب و باپیرانی سووك بکاو.. نهێنیەکە ئاشکرابکا؟.

لەنیوە شەوێك، پاش ئەوەی.. سوننەت و تەراویحەکەی بەجێ گەیاندن، لەسەر بەرماڵ هەڵستا، بەپەنجەکانی دەستی ڕدێنە سپیە درێژەکەی شانەکرد، حەمدو سەنای خوای کرد، لیچکی بەرماڵەکەی هەڵدانەوە، ڕای کردە لای دیوارەکە، دەستی بۆ دەلاقەکە درێژ کرد، کتێبەکۆنەکانی، ئەم لاو ئەولا کردن، هەڵی دانەوە.. و دایناناوە، تا.. پێچراوەییکی زەردی پیری لەناو دەرهێنان! تۆزو خۆڵەکەی لێ داوەشاند، خستیە بن هەنگڵی و گەڕایەوە جێگایەکەی. سینگ و بەرچێر و.. لاشانە کانیی و دامەنی جوببەکەشی داکوتان. بێ ئەوەی لیچکی بەرماڵەکە لێك بکاتەوە، لەسەری دانیشتەوە، چاویلکەکەی لە چاوی کرد، لەسەر خۆ پێچراوەکەی لێك کردەوە، ئاوڕێکی لە دەروودیواری حوجرەکەی دایەوە، بەدەنگ دەستی بە خوێندنەوە کرد:

- لەشەوی هەزارو دووەمدا، شەهرەزاد لەسەر تەختە بەندەکەی لێی ڕاکشابوو، جارجارە نرکەییکی دەکرد، بەدەنگێکی ئاسك دەی ناڵاند، ژوورەکەی لەناوکۆشکە گەورەکەدا. وەك ڕۆژ دەدرەوشایەوە. ئەو شەوە شەوی پێ ئانە دوونیای، بەری شیرنی ئەوینی و دڵسۆزی و یەکبوونی بوو لەگەڵ شەهریاردا.. بەری هەزارو یەکشەوەی پڕ کامەڕانی و دڵنیایی.. بڕواو ئاوات و هیوا.. بوو.

شەهریاریش لەسەرینگانی ژنەکەی، ژنە خۆشەویستەکەی دانیشتبو، بەری دەستێکیی لەسەر



هەتیە گەرمەکەی ڕاگرتبو، ئاو ئاوەش دەستەکەی دەگوازتەوە سەر ڕوومەتە سوورو نەرمەکانی، بە بزەییکی گەش دەیدواند، ڕازو نیازی لەگەڵدا دەگۆڕینەوە.

لەناو ئەم ڕازونیازەدا، لەپڕ سەردەستەی جاریەکانی کۆشک، دەرگای کردەوە!! چرپەییکی بەگوێی شەهریاردا کرد!.. شەهریار دەستەکەی سەر ڕوومەتی شەهرزادی کێشایەوەو.. هەلستایە سەرپێیان، ژوورەکەی بەجێ هێشت.

شەهریار زۆر دڵی بەکۆرپە چاوەڕوان کراوەکەی خۆش بوو، کاتێ خەیاڵی لەڕۆژە ڕابوردوەکانی پێش ناسینی شەهرەزادی دەکردەوە، شەرمێك دای دەگرت، ئازارێکی دژوار دەکەوتە دەروونیەوە!، پەشێمانی لەسەر ڕووی دیاری دەدا، هەر لە پێناو داپۆشین و ڕەش کردنەوەی شوێنی ئەو ڕۆژە ڕابوردوانەو بە بۆنەی ئەم ڕۆژە پیرۆزەشەوە، دەنگی دابوو هەر.. ج.. حەکیم و شالیار، پزیشك و زاناو.. داناو شێخ و کەشیش و پیاوماقووڵ ولێ زانانی چوار قوڕنەی وڵاتی، بانگهێشتن کردبوون، ئەمانەی کۆکردبونەوە هەتا، لە ئاهەنگی لەدایك بوونی، جێگرەکەی، هەریەکە بەپێی تواناو زانایی و.. لێوەشانەوەو شارەزاییان، هەر بنوێنن بۆ ئەوەی منداڵەکەی بەڕێك و پێکی، بێ گرێ و کەمو کورتی، لەدایك ببێتەوە!

لەهۆڵە فراوانەکەی کۆشك، لەبەر دەرگای ژوورەکەی شەهرەزاد، هەزاران لەو.. زاناو دانا..و.. حەکیم و پزیشكو.. فەیلەسووفو.. نووسەرو.. ڕۆژنامەچیو.. پیاو ماقووڵانە، ڕێزیان بەستبوو، چاوەنواڕی لەدایك کەوتنی.. شابەچچەیان.. دەکرد!.

زانایەکان کتێبەکانیان لێك کردبوونەوە، دانایەکان سەریان بەسەر ڕیشیان داگرتبو، لەگەڵ فەیلەسووفەکان، سێ و دوویان بە پەنجە ڕەق و تیژوو درێژەکانیان دەکرد!! لەناو دەریای عیلم و فیکر و فەلسەفە، ووشکەمەلەیان دەکرد! حەکیمو پزیشکەکان چەقۆو نەشتەرەکانیان دەسوین! دەرزی و درێشەو سووژنەکانیان تیژ دەکردنەوە. خەلیفەو دەروێشەکان، شێرو.. زەرگ و ڕمەکانیان ئامادە کردبوونەوە، بریقەیان لێ هەڵدەستا!

ئەستێرەوانەکان، گوێ ماسی و چورتیان هەڵداویشتن، نووسەرو ڕۆژنامەچیەکان، تەواو قوڕمیش کرابوون، چاوو گوێچکەیان کردبوو بەڕادار!

لەڕیزەکانی دیکەش، میر والی.. ئاغا، قومانداناو، بازرگان، فەرمانبەرو ئۆتەراتچیەکان، دەمیان بزەی خۆشی ی لێ دەباری، بەڵام کەس نەیدەزانی، دڵ و دەروونیان چی تێدایە!؟

لەدوای ئەمانەشەوە، ڕیزی گوڵ بەدەستان، دیاری هەڵگران، شاعیرو بخووربژێن، لەهۆڵەکەدا جێگای خۆیان گرتبوو. لە دەرەوەی کۆشکیش، دەرگەوانەکان لەبەر تاقە گەورەکە، خۆیان چاندبوو. چەك بەدەستان بەدەورەی کۆشكدا دەسووڕانەوە.. تا، ئاحەز و.. دوژمن، شەوە.. دێوودرنج وا هەموو ئەوانەی لێیان دەوەشێتەوە.. ژیان بەکۆرپە ساوایەکە بگەیەنن.. لە ئاویان بەرن و.. تەفرو توونایان بکەن.

لەدوای ئەمانەشەوە، لۆتی، مەیمونەوان.. دۆلەنگێو، تەنافبازو، بۆڕی ژەن، چاوەش و سەماکەران، هەر ڕێزە، بەپێی بەهرێك خوا.. پێی دابوون.. دەوری خۆیان دەگێڕا!

لەپاشی پاشەوەش، جەماوەری خەڵکی وڵات.. لە گۆڕەپانەکەی پێش تاقە گەورەکە، لەمەیدانەکانی شار، ئاهەنگیان سازدەدا، بەزمیان دەگێڕا، دوعای ساغی و سەلامەتی ی.. شازادەی تازەو شەهرەزادی دایکیان دەکرد. شەهریاریش لەهەیوانە فراوانەکەدا، لەناو ڕیزەکان دەهات و دەچوو، زاناو گەورەپیاوەکانی دەدواندن، ڕووی خۆشی تێ دەکردن، بزەی شادی ی بەسەردا بڵاودەکردنەوە، ئاونەوەش، بۆ سەر باڵکۆنەکە سەردەکەوت، سەرێکی لەحەشاماتەکەی بەرتاقی کۆشك هەڵدەکێشا، بەرووپاندا دەگەشایەوە.. بەدەست تەمەنای بۆ دەکردن.

کاتێك کە دەنگی: ئەنغا.. ئەنغای.. ساوایەکە لەژووری شەهرزاد بەرزبوەوە، دەرگای ژوورەکە کرایەوە، پیرێژنە سەرسپیە پسپۆڕەکە، بە.. پەلە دەرپەڕیە دەرەوە، بۆ شەهریار.. نوشتایەوە!

شەهریار لەخۆشیاندا ڕاپەڕی، ڕووی کردە هۆڵەکە، بانگی موژدەی ڕاهێشت:

- موژدەبێ.. کوڕێکمان بوو.. شازادەیەکتان بوو!. لەگەڵ ئەو بانگە، هۆڵە فراوانەکە، وەکوو دەریا شڵەقا.. ڕیزەکان، مۆنج.. مۆنج، کەوتنە مل ملانێ و پاڵدان هەر یەکەیان.. دەی هەویست پێش ئەوەی تر بگاتە خزمەت. شاو شاژن!!.. وە بەدیدەنی ی مەلۆتکە پیرۆزەکە.. شادبێ.. لە ئەنجامی ئەو هێنان و بردنەو بەیەکداهاتنەی ڕیزەکان، گەلێك لە ڕیش سپی و بێ هێز.. دەکەوتنە ژێر پێیان! هاواریان لێ هەڵدەستا!.. حەکیم و پسپۆڕو پزیشکەکان، چەقوو نشتەرو.. دەرنافیس و ئامرازە ووردەکانیان لە مەلۆتکە ساوایەکە.. خستە کار! فەیلەسووف و داناو.. زاناکان، چنگیان لەلاشە ناسکەکەی گیر کرد، شالیار و.. بازرگان و ئەوانی دیکە، کە خۆیان لە دواوە دەدی..تەنگاورە بوون، بە پاشە دزە. لەسەرخۆ بۆی دەکشانە دواوەو تا لەپڕ.. بەگوڕ خۆیان لەڕیزەکانی پێشەوەیان دەدا!. بڕیان پێ دەدان.. بەتەکان.. بەمل.. کەلێنیان لەڕیزەکان دەخست، خۆیان لە کەلێنەکانەوە دەبرد.. تاکو دەگەیشتنە سەرمەلۆتکەکە!. مەلۆتکەکەیان لەباوەشی دایکی هەڵدەگرت، هەریەکەیان دەستکاری ی خۆی تێدادەکرد!! ئەمانە ناحەقیان نەبوو.. دڵسۆزبوون!.. هەریەکەیان حەزی دەکرد خزمەتێك پێشکەش بە جێگری شایان بکەن و.. هەروەها شاو شاژنیش ڕازی بکەن!.

بەم ڕەنگە یەکێك لووتی ساوایەکەی دەگوشی.. تاڕاستی بکاتەوە، وەك دەنووکی کوندەبەبۆ.. خواری دەکردەوە! پزیشکەکان ئاوکی کۆرپە ناسکەکەیان لە ڕەگەوە دەرکێشا!! ئەوەی فرچکی دەدا، وەها ڕای دەوەشاند.. جەرگ و هەناوی ساواکەی دەلەقاندن.. دەست و پێی لە.. گەدەبردن!! یەکێك گوێچکەی دەخوراند، لە بناگوێوە هەڵی دەقەنی!! حەکیمەکان لاگونێکی کۆرپەساواکەیان لێ کردەوە.. دەیانگوت:

- لووە زێدە گۆشتە!!

بەهەموو لایێك.. لەخۆشەویستی ی شاو شاژندا، ساوایە کەیان لێك دەکێشایەوە.. تاکو.. شەت و خوارو کەل و کرۆمیان کرد! کردیانە جۆرە دەعبایێك، بەهەموو شتێك دەچوو.. بە.. بنی ئادەم نەبێ!.

شەهرەزادی دایك کە ئەمەی بەچاوی خۆی دیت، لەهەژمەتان یەکسەر.. لەهۆش خۆی چوو!.

شەهریاریش خوێن بەری چاوی گرت، ئاگرێك کەوتە دەروونیەوە، لەڕکاندا.. فەرمانی دا، بۆ ئاخیرجار، دەرگای زیندانی پڕ مشك و ماری.. ژێر زەوی ی کۆشکەکە.. بخەنە سەر پشت! وەلەسەر مێژوو نووسەکەشی کرد کە ئەوشەوە.. لەدەفتەری ژیانی بنەماڵەکەی توومار نەکا.. وەلەهەموو مێژووی دونیای ئەوسەردەمەش بیپەڕێنێ!!.

بەم ڕەنگە، هەتا ئێستاش، هەموو دونیا، هەزارو یەك شەوەکە، دەجوون دەیجوون و کاوێژی دەکەنەوە، کەسێك ئاگاو خەبەری لەم شەوی شەوەزەنگەی هەزارو دوەمینە.. نیە!. شێخ عبدالقدووسی قازی ی شاری (جابولقا) و ئەوەی شێخ قوتبەلدینی گەورە، کە لە خوێندنەوە بوەوە، نووسراوەکەی پێچایەوە، بەچاکی لوولی دایەوە.. لەسەر بەرماڵەکە هەڵستا، خستیەوە جێگایەکەی پێشووی لەناو دەلاقەکەدا. ئەوجا هەر بەپێوە، هەناسەیێکی فێنکی توونـد.. و دووروو.. درێژی هەڵکێشا.. ڕمێك خۆی لێك کێشایەوە، وەکوو بارێکی گرانی لەسەر شانی لادابێ، ئەوها لەشی سووك بوو.. بەهەڵبەز.. هەڵبەز گەڕایەوە سەر بەرماڵەکەی، کاتێ لیچکی بەرماڵەکەی لێك دەکردنەوە، بۆ یەکەم جار وەنەوزێکی.. درێژ درێژی دایەوە!! ماوەیێك هەستی ڕاگرت، گوێ ی ڕایەڵ کردن:

- قوو.. قوو.. قوو.. قوو. وو.. و کەڵەشێری بەیان بانگی دەدا، ڕووی دەقیبلە کرد، فەرزی بەیانی ی بەجێ هێنا، لەسەر بەرماڵەکەی گرمۆڵەی کرد.. تا خەوێکی قووڵ بردیەوە.

# زەوی کچی ڕۆژە

هەبو نەبو، لەو سەردەمەی زەویەکەی، ئێمە هێشتا لە دایک نەببو، داپیرەم بۆی دەگێڕامەوە دەیگوت:

- ڕۆژ بانگی منداڵەکانی کرد ئەو سەردەمە، ڕۆژ کۆمەڵێك منداڵی هەبوون، یەکێکیان ناوی (زەوی) بو.

داپیرەم دەیگوت:

ڕۆژ منداڵەکانی بانگی کنەخۆ کردن، پێی گۆتن:

- ڕۆڵەکانم، کەدەچنە گەمان زۆر لەدایکی خۆتان دوور مەکەونەوە دەنا دێوی گەورە، دەتان ڕفێنێ!!.

منداڵەکان بەقسەی دایکیان پێکەنین:

- هی.. هی.. هی..

چونکە دەیانزانی، دێوو مێو نیەو، دایکیان دەیانترسێنێ هەتا لێی دوور نەکەونەوە!!.

لەڕاستیشدا ڕۆژ گاڵتەی لەگەڵ منداڵەکانی دەکرد ئەویش دەیزانی کە، دێو و مێونینە، بەلام ئەگەر بەوە نەیترساندبان کە (دێوی گەورە) هەیە، منداڵەکانی لەقسەی دەردەچوون گوێیان لە ئامۆژگاریەکانی نەدەگرت ئەمجا، دەچوونە سەر چیا بەرزەکەو لەوێش دەکەوتنە خوارێ و بانگلۆز دەبوونەوە!

جارێك منداڵەکان پێکەوە یاریان دەکرد کە زەوی پێی گوتن:

- بابڕۆین بڕۆین بچینە سەر ئەو چیا بەرزە، بەسەر ترۆپکی هەڵبگەڕێین، لەوێوە تەماشای عالەمی ژێرەوەمان بکەین!!.

منداڵەکان بەزەوییان گوت:

- ئەدی دایکمان نەی گوت لەکاتی یاری کردندا، دوور مەکەونەوە دەنا دێوی گەورە دەتان رویێ؟!!

زەوی بەخوشك و برا بچکۆلەکانی گوت:

- دایکمان دەمان ترسێنێ دەنا ئێوەش دەزانن دێوی گەورەو دێوی گچکە نیە، دایکمان دەیەوێ، لێی دوور نەکەوینەوە چونکی ئێمەی خۆش دەوێ.

منداڵەکان گوتیان:

- دەباشە، کە دایکمان ئێمەی‌خۆش دەوێ چۆن قسەی بشکێنین؟!.

زەوی بە پستەپست پێی گۆتن:

- قەیدی ناکا.. نا.. کورە خۆ دایکمان، ئاگای لێمان نیە!!

بەبێ دەنگی، بۆ خۆمان دەچینە سەر شاخە بەرزەکەو زوو دەگەڕێینەوە!

لەسەر خۆ پێی گوتنەوە:

- دەڵێن سەرتۆپکەی چیاکە هەندە بەرزە هەندە خۆشە لەخوارەوەی عالەمێکی زۆر زۆر جوان و سەیر دیارە بابچین دەی.. بابچین.. دەی.

منداڵەکان خوشك و برایەکانی (زەوی) بەوە ڕازی نەبوون بچنە سەر چیایەکەو لەقسەی دایکیان دەربچن و بە (زەوی) ی خوشکیان گوت:

- ئێمە لەگەڵت نایەین بۆ سەرشاخەکە ئێمە هەر لەکۆشی، دایکمان لە نزیك دایکمان لەئاسمانی پان و بەرین یاریی خۆمان دەکەین.

- زەوی قسەی دایکی شکاند، لەمنداڵەکان جودا بووەوە ملی بەشاخەکەوە نا.. هەر سەرکەوت هەر سەرکەوت هەتا نزیکی لووتکە بەرزە کە بوەوە، کە گەیشتە سەر لووتکە بڵندەکە، ویستی سەیری عالەمەکەی ژێرەوەی بکات سەری سووڕا.. سەری سووڕا.. لەپڕ پێی هەرزەلی و

- گرم قرر.. ر رر

کەوتە خوارەوە، هەندە هەوڵی دا خۆی پێ نەگیرایەوە!! هەر هاتە خوار هەر غلۆر بووەوە.. زۆر هاواری کردە دایکی، بانگی براو خوشکەکانی‌کرد بەلام، نەدایکی ئاگای لەوە بوو کە (زەوی) گوێی نەداوەتە ئامۆژگاریەکانی و چوەتە سەر شاخەکە!!، نە منداڵەکانی دیکەش گوێیان لە هاوارو بانگەکەی زەوی بوو!!.

هەر غلۆر بووەوە.. هەر هاتە خوار.. دەست و پەلی بەهەموو لایێکدا دەگێڕان شتێکی بکەوێتە چەنگ خۆی پێ بگرێتەوە، بەلام دەستی لەهیچ گیر نەبوو هەر هاتە خوار، نەیتوانی خۆی بگرێتەوە، هەتا لەجێگاکەی ئێستای جێ‌گیربوو!!.

ئێوارە کە منداڵەکان گەڕانەوە لای دایکیان (زەوی) یان لەگەڵ نەبوو!!

دایکیان لێی پرسین:

- ڕۆڵەکانم.. ئەدی ئەوە کوا (زەوی) ی خوشکتان؟؟!

منداڵەکان بۆ دایکیان گێڕایەوە، کە چۆن زەوی خوشکیان چوەسەر شاخە بەرزەکە، بەلام ئەمانیش نەیان دەزانی کە (زەوی) لەشاخەکە هەڵدێراوەو کەوتۆتە خوارێ!!

دایکیان دڵی تەنگ بو، دەستی بەگریان کرد کچە خۆشەویستەکەی دەلاواندەوە لەگەڵ فرمێسك ڕژاندنەوە دەی ناڵاند:

- ئای کچم، چاوم ئەم گوت لەدایکت دوور مەکەوە، هەی ڕۆکیژۆڵەکەم ڕۆ.

دایك دەیزانی تازە کچەکەی ڕۆیشت و جارێکی تر ناگەڕێتەوە!! هەر بۆکیژەکەی دەگریا فرمێسکەکانی دەبوون بەئەستێرە، هەموو ئاسمانیان پڕ دەکرد.

ڕۆژ زۆر پەرۆشی کچە جوانەکەی بو کە بەبێ ئاگای ئەو چوە سەر چیایەکەو کەوتە خوارێ و جارێکی دیکەش ناگەڕێتەوە لای لەبەر ئەوە بڕیاریدا، کە هەموو بەیانیێك سەر لە (زەوی) ی کچی هەڵێنێ بەتیشکە زێڕینەکانی بیگرێتە باوەش کە شەویش دادێت و ڕۆژ دەگەڕێتەوە ئەستێرەکان کە فرمێسکی دایکن تاکو بەیانێکی نوێ هەر جریوەیان دێ چاویان ناچێتە خەو دڵی زەوی دەدەنەوە کە بەیانێکی نوێش داهات ئەستێرەکان دەخەون و ڕۆژ سەری هەڵدێنێتەوە، بەتیشکەکانی دیسان زەویی کچە خۆشەویستەکەی، دەخاتەوە ئامێزی دڵسۆزی.



# مۆمەکەی.. شەماشە دنحە

- چیان ئەوێت؟!

- بۆچی وا ئەکەن.. چیان ئەوێ؟!

کابرایەکی پۆشتەی پیرۆنەی چورج کە پێشەوەی ئۆتۆمۆبیلەکەی گرتبوو بەهۆی ئاوێنەی ئۆتۆمۆبیلەکە لەگەڵ هەر جوڵانەوەیەکی لاڕووێنکی لە شەماشە دنحە دەرنەکەوت، جار لە دوای جار ئەو پرسیارانەی دووبارە ئەکردنەوە!!

کابرایەکی پۆشتەی چورچەی پیرو لووس بوو ئەگەرچی زۆر کوێزانی لە ڕووی خۆی سووی بوو کە پیریەکەی دایپۆشێت کەچی لۆچی بناگۆی بەرغەبابەی، سمێڵی، وەسمەداری پتر ڕاسی تەمەنیان ئاشکرا ئەکرد.

- چیان ئەوێت.. چی؟!

جگە لە ئاغاکەش دوو کەسی تر لەگەڵ شەماشە دنحە.. پشتەوەی ئۆتۆمۆبیلەکەیان پڕ کردبوەوە هەر دووکیان چەکدار بوون!

شەماشە دنحە لەگەڵ پرسیارەکە بە پەشێوی چاوی لە دەورەی خۆی ئەگێڕا.. وای بۆ ئەهات کە پرسیارەکە لەم ئەکرێ، شۆفێرەکەش ئۆتۆمۆبیلەکەی وەك با خستبوە گەڕ و لەبەر خۆیەوە منگەی ئەهات و وردە لاوکی ئەگۆتەوە وەکو بڵێی هەر گوێشی لە پرسیارەکە نەبووبێ؟!

- کێ نازانی چیان ئەوێت!!! ئەوەی خۆی گێل ئەکات، دیارە کە مەسەلەکە ڕەوا و ناڕەوا و زۆرداری و زۆر لێکراوی‌یە!؟ شەماشە لەگەڵ خۆی والێکی ئەدایەوە.. ئارەزووی بوو بەم جۆرە‌وەڵامێ وەدەست ئاغاکە بنێت، بەڵام بۆی ناکرێ ئەوەی لەدەروو نیەتی دەریخات و بەدەستی خۆی ماڵی خۆی وێران بکات! دوو زەڵامە تفەنگدارەکەش کەوا دەرئەکەوت پیاوی ئاغاکە بوون یەکێکیان بەتیزەوە، بەپێکەنینێکی خاوی گێلانە هەستی خۆی دەربڕی:

- هی، هی، هی

وەسەیری لوولەی تفەنگەکەی کرد

ئەوی تریشیان کڕ سەری دانەواندبوو، بە لاچاوی سەیری شەریکەکەی ئەکرد، جارجارەش لەجامەکەوە دوور ئەیڕوانیە دەشتە بەرینەکەی زنجیرە گردەکە دواییان پێ ئەهێنا کات ئێوارەیەکی درەنگی بەهار بوو، شینایی دەشتەکەی داپۆشیبوو، رۆژ وەك چاوێکی خوێنینی سوور هەڵگەڕابوو لە لوتکە بەرزە بەفرینکەی سەفین ڕەنگە سوورەکەی دووبارە ئەبووەوە. ئاغاش کە وەڵامێکی چەنگ نەکەوت بێ دەنگی دایگرت، نەفەرەکان سەردەمێك کڕ و جگە لەمنگەی شۆفێرەکەی لەگەڵ پرسیارەکانی کابرای چورچەی پۆشتە پتر هێزی دایە تۆمۆبیل وەکو بیەوێت زووتر دوایی بەڕێگاکە بهێنێ و ئیتر گولە پرسیارەکان نەبێتەوە، جگە لە منگەی شۆفێر و لە هاژەی بای دەرەوە کە لە بۆشایی جامەکان ئەهاتە گۆ هەست بڕیبوون تا لەپڕ کە دوو فڕۆکەی تیژڕەو لە ئاسمان دەرکەوتن هەموویان لار بوونەوەو ملیان بۆلای جامەکان درێژکرد و چاویان دوا بە دوای ڕێڕەوی فڕۆکەکان ئەگوازتنەوە. ئاغا لەبەر خۆیەوە هاتەوە دەنگ:

- کێ توانیویە شەڕی حوکمەتان بکات، دەبا بیخۆن دەی.

- هی. هی. هی

جگە لە پێکەنینە نێرەمۆکەکەی کابرای پشتەوە کەس قسەیەکی نەبوو بۆ ئاغا! شوفێریش لەگەڵ دەرکەوتنی فڕۆکەکان ئۆتۆمۆبیلەکەی هێدی کردەوەو پێی لە سەر بەنزین شل کرد؟! لەمنگەی وەستا. هەر کە فڕۆکەکانیش لەپەنا چیاکە ئاوا بوون بە پەشۆکاوی و بەفیکە نزمی سروودێکی ئەگوتەوە وردە وردە پێی لە بەنزین توند ئەکردەوە. شەماشەدنحەش چاوی بڕین لەمێشێك کە بەجامی پێشەوەی ئۆتۆمۆبیلەکە گیرسابو و تەکانی ئەدا بچێتە دەرەوە، جار لەدوای جار کە ئەکەوت بەجامەکە هەڵئەچووەو خۆی پێدا ئەقرساندەوە، هەر کە گۆلە فیکەی شۆفێرەکە بوو، سەردەمی قوتابیەتی و قوتابخانەی هاتەوە یاد، فیکە کە سەر نزمی سرودێك بوو لەمنداڵیدا لەو سەردەمە ئەمیش لە قوتابخانە خوێندبووی! بیری کردەوەو بیری کردەوە! تا گۆرانیەکەی بەمێشکا تێپەڕ بووەوە:

ئەورۆژ بوو ئاگرێکی وەهای خستە چەرگەوە

لاوان بەعەشق ئەچوون بە بەرەو پیری مەرگەوە



زۆر ئارەزووی بوو لەگەڵ شۆفێر دەنــگ بەرزکاتـــەوەو بەســـەر گۆرانیەکـــەدا بچێتـــەوە!؟ ئــەو ســەردەمە دەنگــی خــۆش بــوو مامۆســـتای کردبـــووی بـــە سەردەستەی تیپی گۆرانی پـۆل. سـەیرێکی نەفەرەکـەی پێشـەوەی کرد لەدڵی گوتی:

- بـۆی، نـاکرێ نـاخێکی هەڵگێشا

- چـۆن مـاڵی خـۆی بەدەستی خۆی برمێنێ؟ هەژارێکی وەکو ئەم ئەگەر دەسەڵاتی هەبوایە لەخۆندن ناگەڕایەوە! لەگەڵ خـۆی دا لێکی ئەدایەوە. دووباە چاوی برینـەوە.. مێشەکەی تیژ پەڕەکانی لێك ئەدان و هەوڵی ڕزگاربوونی ئەدا! ئاوڕێکی لە دوو نەفەرەکـەی تەنیشت خـۆی دایـــەوە، ئـــەوەی ڕۆخـــی ئـــەو لاتفەنگەکـــــەی بەدەرگاکـــــە هەڵپەساردبوو و لەلوتکەی چیاکانی بەرامبـەری ئـەیڕوانی کـە ڕۆژئاوا تـەمێکی سـووری تـەڵخی بەسـەردا ڕشتبوو لـە بـیرێکی قـووڵ نقـووم ببوو.

ئەوەی ناوەندیشی تفەنگەکـەی لە ناو لینگ و لەپێ گرتبوو، وەکو خـەوتوو چـاوی لەسـەر یـەکتر دانابوون. لە ئاوێنەکەدا لاڕوویێکی لووســی لــۆ چـاوی ئاغاکـەی لێ دەرکەوت، سمێڵە وەسمەدارەکەدی وەك تیسـکە مـوی بـزن ئەهاتـە بەرچاو!

- دەم و چاویشـی هـەر لـە بزنـە گرویێ ئەکەن!

شەماشە ئەمەی بەخەیاڵدا هات لە دەرونیشیەوە قینێکی لەم نەفەرە جێگیرە بوو..

- هـەر لـە ئاغـا کەچەڵـە سمێـڵ وەسمەدارەکـــەی گوندەکـــەمان ئــەکات! لەگــەڵ خــۆی والێکــی ئەدایـەوە. ئەوەی هاتـەوە یـاد کـە ئاغا کەچەڵەکەی گوندەکەیان چەند بـێ شـەرم و ئـابڕووە! کاروکاسبی ڕێگا بە ژنان گرتنەو لە بەیانی تـا ئێـوارە لەسـەر ڕێگـای کـانی گونـد شــەڕ بــە کچــەکانی ئەفرۆشــێت! دەسـتێکی بەنێوچـەوانی داهێنـا، هەناسەیێکی درێژی خواردەوە:

- بانگی خوا بکـەن ئـەی هـەموو زەمین(1)

ڕووی وەرگــــێڕا لـــــەجامی ئۆتۆمبیلەکە ڕوانیە دەرەوە، زەمـین لە ناودەمی گەورەی ڕۆژئاوا مەلەی ئەکردو گەردێکی بۆری لێ نیشتبوو.

- ئاغا کەچەڵەکەی گوند شەری بە (شیرین)ی دەسگیرانەکەی ئەمیش فرۆشت تا ڕێگاکانی پێ بڕی! کە شیرنی دەسگیرانی هاتەوە بەر چاو وەکو لەکەسێکی تەنیای دوور وڵات هەڤاڵێکی بدۆزێتەوە، وادڵ تـەنگی و هەستی بێ کەسیەتی و تـەنیایی بڵاوەیان تێکەوت. هێمنیەك لەسەر ڕووی پەیدا بوو.

- بەیانی ئەو ڕۆژە کە بەرەوشار ئــەمات چــوەماڵیـــان چـــاوی لێ تێرکردن.

شەماشــە بزەیێــك گرتــی کــە ئەوەی هاتـەوە یـاد، چۆن بـەزۆری دوو چـای زۆر خەسـت و شـیرینی دەرخوارددان، هەر چەندە گوتـی و گوتیــەوە کــە چــای خواردۆتــەوە دادێکـــی ئـــەداو پـــاش تکـــاو کێشەیەکی زۆریش هەتا بەوە ڕازی بوو بەو دوو چایە وازی لێ بێنی.

- بــەڵام کــێ لـــەو شـــیرینترو خۆشترە؟!

ئەوەش بوو کە هەستا تـا بـەر دەرگـا بــەڕێی کــردو ڕای ســپارد دەســتەیێك مۆمــی ڕەنگــاو ڕەنــگ لەگەڵ خۆی بهێنێ تاشەو لە "سوو ڕەحمان(۲)" بە ئومێدی خۆشی دوا ڕۆژیان لەسەر گۆڕە پیرۆزەکە دایان گرسێنن..

- تــا خــوا بــەمرازیان بگــەیێنێ کــوڕو کچـی زۆریــان پــێ ببەخشــێ (شیرین) وای ڕاسپارد بوو.

دەستی بە باخەڵی داگێڕا خۆی دڵنیــا کــردەوە کــە خواســـتی دەسگیرانەکەی جێ بەجێ کردوە.

دەســـتەیێکیش پــــتر مۆمـــی کڕیبـــوون بـــۆ ئـــەوەی ئـــەمیش بـــۆ ئــاواتێکی تـــر لەدەوروپشـــتی سوورەحمان دایان بگیرسێنێت.

- بـۆ ئـەوەی خـوا ڕووناکیـەك ببەخشێت بە وڵات و گوندەکـەی ئاسوودە بکات، لەستەم و قەزاو بەڵا دووری بخاتــەوە ئـــەو ســـتەم و زۆرداریەی لەو ڕۆژانـە گەیشتبونە ڕادەیێك ژن و منداڵیش بگرێتـەوە ژن و منداڵیش ئـازار بدرێـن و لـە بەندیخانە قایم بکرێن. پـیرو ڕیش سپی‌ش دڵشکاو بکرێن!!؟

- قەشەی پیاوی خوا کـەی هـی گرتـن و تـێ هـەڵدان بـووەو قسـەی ناشیرینی پێ‌گوتراوە!؟ مەلای ڕیش سپی چۆن بـە مێزەرەکـەی پـەتك کرابوو؟! لـەچ دەورو زەمـانێك ئـەم ناڕەواییـــە ڕووی داوە؟! شەماشـــە سورهەڵگەڕابوو و هەناسـەی تـەنگ ببوو، فرمێسك لەچاوەکانی زابوون، کە دیمەنی ڕۆژەکەی هاتەوە بەرچاو دوو گەنجەکەیان لە لوولـەی درێـژی تۆپـی تـانك بەپشـتبەندی خۆیـان هـەڵیان واسیبوون، لوولـەی تۆپـە گەورەکەشیان بـۆ ئـەم لاو ئـەولای شەقامەکە ئەجوڵاندەوە!؟ شەقامەکە گیان لەبەری تێ نەمابوو، خەڵکەکە لـە تـرس و لـەتاوی گیانیـان و بـۆ ئـــەوەی چاویـــان لـــەم دیمەنـــە دڕندانەیە دوور خەنەوەو گوێیان لە هـاوارو ناڵـەو داد خواسـتنی لاوە دیلـەکان نـەبێت بـە بـێ دەسـەڵاتی خۆیان شاردبووەوە.

- بــەڵام، قــەوماوێك لەمێشــك نەخشـاو چەسـپا بـە ئاسـانی ناسـڕێتەوەو ڕەش نابێتـەوە!! بـا لەبەرچاویش بـزر بووبێت! بـاوکی پیـاو، دایکـی مـرۆ لـە بـەرچاوی ڕۆڵـەی ئیهانـەبکرێت!؟ بروایـی و پـیرۆزی مـرۆڤ، بـێ ئابڕوانـە پـێ شێل بکرێت؟!

- لەچ زەمانێك ئەمە ئەکراوەو لە دارستـانیش ڕوونـادات دەروونـی شەماشە وا دەنگی ئەدایەوە.

- بانگی خوا بکـەن ئـەی هـەموو زەمین

دوو فرمێســـکی گـــەورە لـــە چاوەکــانی بـــارین و بەســـەر چەنەگەکـەیدا ڕژانـە نـاو کۆشـی، خۆزێیێکـــی فرمێســـکاوی لـــە گەروونێکی تاڵ قووت دایەوە، ئەو کاتـە لـە لۆڤـەکانی (بـەنی بیرمـەم) سـەرئەکەوتن، شوفێر لە پڕ بـانگی کرد:

- ئاگـاداربن، نزیـك نوختـەی پشـکنینەوە بوویـن ئـەوەی شـتی قەدەغـەکراوی پێیـە.. بـا فـڕێی دات!!

لەگەڵ ئەم بانگە شەماشە دنحە ڕاچڵەکی، ڕستەی بیرو خەیاڵەکانی لێ پچڕان، سەری هەڵبڕی، شۆفێرەکە تۆمۆبیلەکـــەی زۆر لەســـەرخۆ لێ ئەخوڕی یەکسەر چاوی لە مێشەکە چەقینـەوە کـە بەوەرەسـی هـەوڵی ئـەوەی ئـەدا لـە جامەکـە ڕزگـاری بێت، ئارەزووی ئەوەی بۆ هات کە لـە شـۆفێرەکە داوابکـات مـاوەبدا مێشـەکە دەرچـێ؟ کـە شـۆفێر بـە دەنگ نووسی:

- کەس شتومەکی قەدەغـەکراوی پێ نی‌یە؟!

زەڵامـــە چەکدارەکــــەی ڕۆخ دەرگای پشتەوە گوتی:

- شتوومەکی قەدەغەی، چی!؟

- شتی ترسناك و زیان بەخش!؟ شوفێر وەڵامی دایەوە

- بەرێ وەڵێ من ترسناك ترین و زیان بەخشترین شتم پێیە!

بەیارمەتی ئەمینداریتی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان چاپکراوە

محمد مولود (مەم)




بەرگی دووەم

١٩٨٤

شـوفێر بەتـەنگاوی و بەپەلـە پرسی:

- چی‌یـــە؟ چ؟ دەی بیـــهاوێژە فری‌ی‌دە؟!

وە ئۆتۆمۆبیلەکـــەی ڕاگرت.

شەماشـــە دنحـــەش کەوتــە گومــان و لەبـــەر خۆیەوە لێکی ئەدایەوە

- ئەم تـەنیا چەند گـەز پاتاڵی بووکی پێیە لەگەڵ هـەندێ خەنــەو نوقـڵ و شەقشـــەقەو بلوێـــر و توپێکـی بچووکیـش بـۆ منداڵە بچووکـەکان تـەنیا ئەمانـــەو دوو پــاکێت جگەرەش بۆ مام قەشەو.. ئـا.. دوو دەسـتە مۆمـی ڕەنگـاوڕەنگیش! تارمـایی ترسـێکی نادیـار بـاڵی بەســەرداگرت، ویسـتی پرسیارێك بکات کە لە پڕ کـابرای چەکدار لـەوەڵامی شۆفێرەکە گوتی:

- تفەنگـە.. تفـەنگ.. لەتفـەنگ ترسناك و بەزەرەر تر هەیە؟!

چەکدارەکەی تـری تەنیشتی و ئاغـای پێشـەوەش دایـان لـەقاقای پێکەنین.. شۆفێرەکە دیار بوو زۆر پەست بوو و وەڵامی کابرای بەگاڵتە پێ کردن ژمارد، لەبەر ئەوە سوور بـووەوە کـەچی خــۆی گــرت و بەتووڕەیی و تەوسەوە گوتی:

- تفەنگ لەدەستی هەموو کەس ترسـناك و زیـان بـەخش نی‌یــە، بەتایبـەتی لــە دەســت ئێـوەی وەقسـەکەی گێڕایـەوە شەماشـە دنحەش بەئاسایی و بێ ئەوەی بیر بکاتـەوە چی ئەڵێ لـە شـۆفێرەکەی وەرگرتەوەو لەبەر خۆیەوە گوتی:

- ئێـوە تفـەنگتان بـۆ خۆتــان هەڵنـەگرتوەو بەکـەیفی خۆتــان بەکاری ناهێنن!! ئێوە بەشێکن لە تفەنگەکە؟!

شـــۆفێرەکەش بـــەدەنگێکی گاڵتـەجاڕی و بەنزمییکـەوە بـانگی کرد:

- ئـەوەی قەدەغـە و ترسـناکە، شکرە، چایە، گەنمە، نانەدەرمانـە، قەڵەمە، کـاغزە، نەوتـە، ڕۆناکیـە وە دەرگای ئۆتۆمبیلە کەی کردەوەو دابەزی و دەرگاکەی بـەتوندی لێك دایەوەو مرتاندی:

- هەر پیاو کوشتن و سوتاندن و ماڵ وێران کردن.. قەدەغە نەبێت.. و

شەماشە دنحە کە ناوی نەوت و ڕووناکی بیست دڵی کەوتە خرپەو ترس:



- خۆ.. مۆمیش قەدەغەنی‌یە؟!

وە بــەزمانی ســوتای ئــەم پرسیارەی هاویشت. شۆفێر لەگەڵ پرسیارەکە ڕاچڵەکی و قیژاندی بە سەر خۆیدا:

- مۆم.. مۆم ئەدی هەی هـاوار نەمگوت.. ڕووناکی قەدەغەیە مۆم، نەوت، ڕووناکی، چاکـە، پیـاوەتی، شەرەف، غیرەت ناමووس، بەزەیی، ئینسـانیەت، هــەموو ئـەم شـتانە قەدەغەن، لەم ڕێگایـەداو هـەتا نـاو چیـا؟! ئەتانـــەوێت مـاڵم وێـران بکەن؟!! ئەفەرەکان لەگەڵ هاوارەکە سـەردەمێك تاسـان، شـۆفێر وەکـو هەسـتی کردبێــت کــە بــێ هــۆ واقیژانـدی ســەیرێکی شەماشـە دنحەی کرد کە بەواق وڕماوی دەمی بەش کردبووەوەو لەجێگاکەی لەناو تۆمۆبیلەکـە وەك (بـت) سەرسـام.. دانیشتبوو لە خۆی تەریق بووەوە و شـەرمێك دایگـرت، بـۆ دڵدانـەوەی شەماشە بە هێمنی و شـەرمەزارانە گوتی:

- کـاکی خـۆم زویـر مەبـە، مـن هـەندێك شـێتم وە کـە نزیـك ئـەم نوختانـەش ئـەبم یـەکجار خوێنـم هەڵئەچێت؟! وە پرسی:

- باسی مۆمت کرد.. گوتت مۆم قەدەغە نەبێت؟!

شەماشە لەوەڵاما گوتی:

- ئەرێ بەسەری تۆ.. برا ئەزانی ئیمشەو یەکشەمەیەو.. خدرلیاسە،

بـۆ ســوورەحمان هــەندێك مۆمــی ڕەنگاو ڕەنگم لە شار کڕیوون.. وە دوو دەسـتە مۆمـە بچووکـە ڕەنگـاو ڕەنگەکانی لـە باخـەڵ هێنانە دەرو لەناو لـەپی‌دا ڕایگرتـن. شـوفێرەکە بەوردی و بەزەیینکەوەو بەدووچاوی کـراوەی ووشـك سـەیری دەسـتە درێـژە کراوەکانی شەماشـەی کـرد، ڕووی گـرژ بـوو، لێوەکـانی کشـت بـوون، دەمـی گـیرا، نـەیتوانی چ وەڵامێك بداتـەوە. شەماشە کـە لـە چۆنیەتی شوفێرەکە تێ گەیشت بە پەرۆش سـەیری مۆمـەکانی کـردن، وەك بروسـکە وێنـەی (شـیرن)ی دەسگیرانی بەمێشکا ڕابوردو بیری بە (شێخ سوورەحمان) وە بەسترا.. لەبەر خۆیەوە لێکی دایەوە:

- بێ گومـان، شـیرن پێـم بـروا ئەکات، خۆ سوورەحمانیش هەر من نیـم هــەزارانی وەك مــن ئیمشــەو ڕووناکی ئەکاتـەوەو مۆمـی لەسـەر دائەگیرسێنی. مۆمەکانی هاویشتنە سەر شەقام.. پێش شۆفێرەکە.

- شەرت بێت، گیشە دارێك ببەم و ئیمشـەو لەسـەر سـەری سـەرەوەی ئەشکەوتە کە ئاگری پێ بکەمـەوە، ئاگرێکی وا کە ملیۆنان ملیۆن مۆم ڕوونـاکی و تینـی ئـەو ئاگرەیـان نەبێت. لەبەرخۆیا وا ئـەی مرتـاند. شـۆفێرەکەش بـەکزی، سـەیرێکی، مۆمـەکانی کـرد کـە لەسەرشـەقام گەوزیان ئەدا، نـاخێکی هەڵکێشاو بـێ دەنـگ سـواری ئۆتۆمۆبیلەکـە بـــووەوە، دەســـتی کـــردەوە بەمنگەمنگ:

- مەلیکۆ.. مەلیکۆ

وە بـەگوڕ پــێ‌ی لــە بــەنزین گیرکرد، ئۆتۆمۆبیلەکەی وەك تیر لە هەورازەکـە ئـەفڕاند. ئەفـەرەکان لەگـــەڵ تیـــژرەوی ئۆتۆمۆبیلەکە ڕاچڵـەکین و هـــەر یەکـــەیان خـــۆی بەجێگاکەیەوە قرساند بوو و دەسـتی لـە ئاسـنەکەی پێشـەوەی تونـد کردبـوو، کەسیان هەسـتێکی لێـوە نەئەهات. کـە لـە نوختـەی پشـکنینەوەش ڕزگاریـان بـوو، وە لــە نشـــێوەکە سەرەوژێر ئەبونەوە ئاغای پێشەوە بۆڵاندیەوە:

- ئەدی ئەوەیان ئەوێت، دە کـەنگی لــەم ڕێگایــە وابووە؟!

کەسی تـر دەنگێکـی لێـوە نـەهات بـۆ وەڵامدانـەوەی ئاغا شەماشـە دنحـەش پـتر دڵی تەنگ بـوو و ئـەو قینەی لەناویا جێگیر بوو تا ئەهات بە هێزتر ئەبوو، زۆر ئـارەزووی بـوو کـە بتوانـــێ وەڵامێکـــی ئەفەرەکەی پێشەوە بداتەوە، لەسەر خۆ جامی ئۆتۆمۆبیلەکەی کردەوەو ملی درێژ کرد.

- خـــ ك ت ف ف و

خوزێکـی گــەورەی فڕێدایــە دەرەوە، چەرخەکانی ئۆتۆمۆبیلەکە بــەگورجی ســوڕیان ئــەخواردو ڕێگەکــەیان هەڵئەلووشـــی ڕۆژ بەئاسـتەم شـۆنی بەسـەرتۆپکەی سـەفینەوە مـابور دۆڵەکـەش تـا ئەهات بۆرتـر ئـەبوو. دنحە سـەری کۆچ کردبوو و کـەوتبوەوە دەریـای قووڵی بیرکردنەوەو ئاوات خواستن، مێشك و دەروونـی وەکـو مەنجـەڵی سیر ئـەکوڵی و هەڵئـەچوو، لەگـەڵ خۆیا بیری ئەهێناو ئـەبرد و لـووڵ ئەداو خاوی ئەکردەوە، تا دڵنیایی پەیدا کرد بەوەی کە هەر گەیشتەوە گونـد یەکسـەر پەیمانەکـەی بـەجێ بگـەیێنێت وە لـە سـەری سـەرەوەی ئەشـکەوتە دێرینەکـە ئـاگرە کـە بکاتـەوە، وە لــە پێــش چـاوی خـەیاڵی، ئـەو شـەوە سـوورەحمان ئـەبوو بەیـەك پارچـە ڕۆنـاکی و هەزاران ئاگر لەدەوروبەریا لە چاوی ئاسمان ئەچەقین، وە لە ناو مۆمـی ڕەنگاو ڕەنگ ئەدرەوشایەوە.

(١) یەکێکە لە ئایەتەکانی (تەورات)

(٢) مـەزارێکی پیرۆزە لەئەشـکەوتێکی دێرین لەناوەندی چیای سەفین، موسڵمانیش بە پیرۆزی ئەناسن.

## پایزە خەون

ڕووداوەکانی ئەم داستانە دەگەڕێتەوە سەردەمی عوسمانلیەکان و داگیرکەرە ئینگلیزەکان لە عێراق و کوردستاندا"

زوربەی کەسەکانی لەو کاتەدا هەبوون"

"ویستوومە خەڵکی نووستوو لە ئازارەکانیان هۆشیار بکەمەوە"

لەبەر ڕێگاوە لەگەڵ خۆی دەدوا دەیگوت:

- خوا حەمەچاوەش بگرێ دەنا بۆچ ئەوەندە گیر دەبووم.

پشووی نیوەڕۆ، چاوەشەکە بە کرێکارەکانی گوتبوو:

"ژمێریار لەشارەوەدێ و مانگانەکەیان وەردەگرن"!.

ئەگەرچی مانگ هێشتا چەند ڕۆژێکی تێ مابوون..و، هەرگیز ئەش قەومابوو، پێش تەواوبوونی مانگ، مانگانەی کرێکاران بدەن.. بەلام چونکی نزیک جەژنی قوربان بوو.. نەیتوانی بڕوا بەقسەکەی حەمەچاوەش نەکا:

- ئێمە.. لەوانەیە گەورەکانیش هەستیان بە چۆنیەتی ئێمەو.. ئارەزوویان کردبێ، لەبەر خاتری جەژن یارمەتیمان بدەن.

- کاک ڕەشید بەم ڕەنگە دڵی خۆی دەدایەوە


سیدەکان، ئابی ١٩٤٨

کە هێوارەش داهات و ئیش پایدۆزی لێکرا، کرێکارەکان بلاوەیان لێکردو بەرەو گوندەکانیان گەڕانەوە، تەنیا ئەو چاوەڕوانی حەمە چاوەشی دەکرد!!

کرێکارەکان دەیانزانی: "درۆ لەلای حەمە چاوەش ئاو خواردنەوەیە"

تەنیا ئەو چاوەنواڕی دەکرد.

نزیک ڕۆژاواش، کەچاوەشەکە بانگی کاک ڕەشیدی کرد:

- ها جەردە.. دەڵێی بەتەمانێی ئەم هەینیە بگەڕێیتەوە ماڵ!.

چاوێکی بە کەلەشی کاک ڕەشیددا هێنان و پێکەنینێکی لێرەمووکانەی لێ بەربوو، ئەوکاتە جەردە هەستی بەخۆی کرد، بۆی ئاشکرابوو کە حەمەچاوەش چ درۆزنێکە.

بەخۆی گوت:

- عەلە ئێختەو تۆمای هاوڕێی، هەروا کرێکارەکانی دیکەش ڕاستیان دەکرد کە دەیانگووت:

- قسەکانی حەمەچاوەش، هەر تەنیا "با" یەو چاوەشەکە لەزگی خۆی دەری دەکا!.

خوزییەکی تاڵی قووت دایەوەو ئەرمە ئاهێکی هەڵکێشا، بەڕکەوە چاوەکانی لە حەمەچاوەش گیر کردن، بە دڵساردییەکەوە ڕووی لێوەرسووڕاندەوە، بەبێ ئامانج سەری بۆلای "سەفین" هەڵبڕی.

ڕووی گوازتەوە لای "پیرمەم"

ڕۆژ خوێنی لە ڕۆژئاوادا ڕژابوو. پەڵە هەوری سپی وەك "کولیك جوانەمەرگ" بەدرێژایی ئاسۆی ڕۆژهەلات، قۆپەنیان بەستبوو، بەبێ دەستی خۆی ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا ڕووی بۆ تیلمە ڕێگایەکەی بەردەمی گواستەوە.. لەبەر خۆیەوە گووتی:

- بەیانی هەینییە.. هەر دەبێ سەر لەمنداڵەکان بدەم.

بەبێ ئەوەی سەرکارەکەی بدوێنێ، یان وەلامێکی بداتەوە، کەلەشی جوولاندەوە، ملی بەڕێگاوە نا.

* * *

پایزێکی درەنگ بوو دارو دەوەنی ئەو ناوە، لەگەڵ هەوای پیرەپایز، وەك فرمێسك گەلایان دەڕێژتن.

دەنگی قاسپەی تاقە کەوێك، لەگەڵ شنەی با، لە شاخەکەوە دەهات و تێکەڵ بەخشپەی گەلا مردووەکانی ژێر پێی دەبوو.. دەیدا لە پەردەی گوێچکەی.

بیری بۆلای تاقە کەوەکە.. فڕی.

لەخۆی پرسی:

- دەبێ بۆچ لەڕەوەی دابڕابێ؟.

بیری بۆ ئەوە چوو کە ئەم کەوە، لەو کەوە کۆچەرانەیە کە بەهاران بەرەو کوێستان سەردەکەون، پایزانیش لەگەڵ گەلاڕێزان بۆ گەرمیان دادەبەزنەوە.

- دەبێ بۆچ لەڕەوەی خۆی بەجێ مابێ؟

پرسیارەکە لە مێشکیدا دووبارە بووەوە.

- ئاوارەیە.

- ئەمیش ئاوارەیەو بەسەر لێ شێواوی سینگی داوەتە ئەم شاخ و کەپك و هەڵدێرانە.

وەها لەگەڵ خۆی دەدوا.

لەگەڵ ئەو بیرکردنەوەو لێکدانەوەیەشی، سەردەمی ئاوارەیی خۆی هاتەوە یاد.

ئەو سەردەمە منداڵێکی فەراژی بوو.. کە لەشکری دوژمن هێرشی هێنایە سەر گوندە جوانەکەیان و سووتاندیان و وێرانیان کرد، باوکی لەگەڵ پیاوەکانی دیکەی گوند چووبوە غەزای دوژمن.

خەڵکی گوندیش، پیرەپەك کەوتە.. ژن و منداڵ، ئەوانەی لەسووتان و وێرانکاریەکە ڕزگاریان ببوو، ڕوویان کردە چیاو ئاوارەو دەربەدەر ببون. ئەویش وەکو کۆمەڵێك منداڵی بێ سەرو دەرو بێ دەسەلات.. باوك و دایکی وون کردن، لەناو ئەشکەوتەکان، لەناو دۆڵ شێو.. و دارستان، لەناو چەمەکان کەوتبوونە سەر ڕوو.

- هەرگیز، دایك و خوشکە چکۆلەکەی ئەدۆزینەوە، فرمێسکێك لە قولینچکی چاوی قەتیس ما.

- دوژمن زۆر خەڵکی لەناو برد.

ڕەشید.. ئاهێکی هەڵکێشا، خوزیێکی تاڵی قووت دایەوە.

قەبۆ.. قەبۆی، تاقە ئێرەکەوەکە، بڵاوەی بەبیرکردنەوەی کرد.

سەرێکی هەڵبڕیەوە، ماوەیێك گوێی بەدوای دەنگی کەوەکەدا.. ناردن.

سەری بۆ بەرپێیەکانی داخەواندەوە. نیگەرانییێکی بەدڵدا هات.

دونیا لەپێش چاویتانەییێکی زەردو لێڵی دەپۆشی و تەنگ تر دەبوو.

بەپەلەو بەئارەزوێکی توونید، بەرێگاکەدا دەچووە پێش، وەکو بیەوێ چۆنیەتی ئەو کات و ساتەی بەدوایەوەدا بەجێ بهێڵێ.

چاوەکانی پتر لە پێیەکانیەوە ئاڵابوون، دەیهەویست خۆی لەو بیرکردنەوەو یادگارانە بشارێتەوە.

بەبێ دەستی خۆی دەستی کرد بەژماردنی هەنگاوەکانی:

- یەك.. دوو.. سێ.. شەش.. چل و چوار.. هەفتاوشەش.. نەوەدونۆ.. سەد.

کە دەگەیشتە سەدیش دیسان لەیەکەوە بەسەریدا دەهاتەوە:

- یەك.. دوو.. سێ.

وەکو هەموو ژمارەکانی دونیا لەسەدەوە کۆتاییان پێ بهێنێ.

هەتا دەشچووە پێش پتر لەناو ژمارەکان گەوزی دەداو دەتوایەوەو خۆی وون دەکرد.

کە لە پێچەکەی "دەرمانئاوا" سوڕایەوەو گەیشتە بەرامبەر "شێرەسوار" ڕۆژئاوا بۆر هەڵگەڕابوو، مەلای گوندەکەی ئەوبەر ڕووبار "بانگی شێوان"ی دەدا، دەنگی مەلا لەدوورەوە وەك شانە زەردەواڵەییێکی وێڵ، لەپەردەی هەست ر گوێچکەی دەناڵان.

لەگەڵ بانگەکە خۆی دۆزیەوە. سەرێکی لەقاند، تەزوێکی سارد بەلەشیدا هات، بەسەلەواتێك، پێشوازی لەبانگی شێوان کردو لەبەرخۆیەوە گوتی:

- لە "گردەچاڵ" لادەدەم.

وەکو تەزووە ساردەکە ئازاری بەلەشی گەیاندبێ، هەردوو دەستی خستە ژێر هەنگڵی.

چاوەکانی بۆ ئەوبەر ڕووبار پەڕینەوە.

دارستانەکە خۆی لە پێخەفێکی ئەستووری ڕەش لوول دابوو، داربەڕووە زلەکان وەك ڕەشماڵ لەناو بۆرایی ئەو هێوارەیەو ڕەشایی دارستانە چڕەکە، سەریان هەڵدابوو.

چاوی بۆ بەرپێیەکانی خۆی گوازتنەوە! بەبۆڵەییێکەوە خۆی دواندەوە:

- لەگردەچاڵ لادەدەم.

- خۆم گەرم دەکەمەوە.

- نوێژی شێوانیش لەوێدا بەجەماعەت دەکەم.

لەناو دەروونیشیەوە، خۆی لەوە خۆش کردبوو کە لەگەڵ مەلای مزگەوتی گوندی شیو بخوات.

هێمناییێك دەروونی فێنك کردەوە، بەهەنگاوی گورج و بەتین بۆ گوند شۆڕ دەبوەوە.

کاتێ بەچوستی پێی دەنایە سەر بەردەبازەکان و بەسێ بازی فراوان لە ڕووبارەکە دەپەڕیەوە.. بەخۆی دەگووت:

- چەند خۆشە.. مرۆ بەلەشی سووك بێ، وە لەگەڵ خۆیدا بیری دەکردەوە:

- پیرو ڕیش سپی گوندەکەمان دەڵێن:

"باوکی ڕەحمەتیم پیاوێکی گورج و گۆڵ و چوست بووە، لە هەموو گۆڤەند و شایی و زەماوەندەکانی گوند و هەرێمیش میرکوڕ و سەرچۆپی کێش بووە، بەیەك ئەفەس بێ وەستان بە سەفینی هەڵگەڕاوەو هەتا گەیشتووتە "گۆڕایی خانزاد" و "کەپکی کایسان" پشووی نەداوە. پیاوێکی سەرکەش و مل ڕەقیش بووە، تەنانەت لە میریشی نەخواردووتەوە، پاش کشانەوەی لەشکری دوژمنیش، ئەو ماوەییێك هەر بەچیاکانەوە ماوەتەوە.. ڕاوی پەڕاگەندەی لەشکری دوژمنەکەی کردووە."

وە دەڵێن:

"سەبارەت بەو ئازایی و بەجەرگییەی، سەبارەت بەو خوو و.. تەنیاتەی ناویان ناوە جەردە"

ئاهێکی کورتی هەڵکێشاو بەخۆی گوت:

- ئەو سەردەمە، ئەوەی بەڕاستی جەردە نەبوایە ئەوەی دزو دروزن و پیاوکوژی ئاغاو حەڵقە لەگوێی دەوڵەت و دەست ئەستوورەکان نەبوایە، بەیاخی بوو بەجەردە حیساب دەکرا.

سەرێکی بادا:

- کوڕە سەیرە سەیر! خەڵکەکە ناوی منیان هەر لەبیریش نەماوە.!!

- هەتا حەمە چاوەشی سەرکاریش کەس بەناوی خۆم بانگم ناکەن.

- ە جەردە.

بەدەنگ چەند جارێك بانگی کرد:

- جەردە جەردە جەردە.

وەبەبێ ویستی خۆی ئاوڕێکی بۆ دەوروبەری دایەوە، هەرچەندە بەڕواڵەت و لەسەرەوە بەو چۆنیەتیە قەڵس و سەخڵەت دیاربوو و هەناسەییێکی گەرم لە دەروونیدا هەڵ بوو، بەڵام لەدڵدا، لەناوەوەی جۆرە هەوەسێکی بەخۆی دەهاتەوە.

- لەم ڕۆژانەدا جەردەکان، لە "کاکی هیرانێ" بەساف و بەڕێزو حورمەت ترن.

لەگەڵ خۆی لێکی دەدایەوە:

- بەڵام کەنگی ئەو جەردەیە؟.

وە دیسان لەخۆی پرسیەوە:

- جەردەکەی ئەو تەنیا ناو و ناتۆرەییێکە، بە نارەوا دڕکەدڕکە پایزە.. لە پەرێزی باوکیەوە، بە دەلینگیەوە نووساوە.

- کەی ئەو یان کەی باوکی خوالێخۆشبووی جەردە بوون؟

بە هەناسەییێکی توند، تین و گورج و گۆڵیدا بە سیپەلکەکانی.



وێنەی حەمە چاوەش و ژمێریاری لەبەر چاو قیت بوونەوە:

- ڕووی ڕەش و گرژ و مۆنی ڕووی چورچ و پڕ لۆچی حەمەچاوەش کە درۆو ساختەی لێ دەباری.

- دەمو لووتی خەپلەو ورگی بنەل و ئەستووری ژمێریار، کە نیشانەی گەلحۆیی و چڵێسی دەنوێنن.

"ڕووداوێکی سەیر، وەك برووسکە بە مێشکیدا ڕابوورد.

جارێك عەلە ئێختەی هاوڕێی، لەکن حەمەچاوەش بە ژمێریاری گوت:

- قوربان، مادام هەر بە ئێختە بانگم دەکەن

- مادام پێتان وایە، منیش ئێختەییکم، ئەدی بۆچ ڕۆژانەی ئێختەییکم بۆ نانووسن؟

- بۆچ ڕۆژانەکەم، ناگەیەننە ڕۆژانەی ئێختەییك؟"

جەردەکە.. ئەو دیمەنەی هاتەوە بەرچاو، لەسەرەوە بزەییکی گرت دەهات لەبنی زگیشیەوە بکوڵێ:

لەگەڵ خۆی لێکی دەدایەوە:

- ڕۆژانەی خۆی‌و، ڕۆژانەی عەلە هی تۆمار سلێوەش.. وەك ڕۆژانەی هەموو کرێکارەکان تەنیا "دە" عانە بوو.

- دە عانە.

- بەڵام ئێسترو بارگیر، هەریەکەیان ڕۆژی دوو ڕوپیەی بۆ دەنووسرا

- گوێ درێژیش تەنیا تاقە ڕووپیەییك ڕۆژانەی بوو.

پێکەنینەکەی لەبنی زگیەوە بەندی کردبوو، سەری کردو بەدەنگ لەبەر خۆیەوە.. دای لەقاقای پێکەنین بەتایبەتی کە بیری دەکردەوە:

- هەر ئێستر.. یان بارگیرێك، بارتەقای سێ بەنی ئادەم بوو!!!

- بەڵام ئێسترو بارگیر!.. بەو پێیە ڕۆژانەی سێ کرێکاریشیان بۆ دەنووسرا

- دووکەریش بەسێ کرێکاری خواپەرست خورد دەکرانەوە.

پێکنینەکەی کاك ڕەشید تا دەهات توندتر و بەرزتر دەبووەوە، ئاو دەزایە چاوەکانی، بە لچکی پشتێندەکەی چاوەکانی وشك کردنەوە، کەوتەوە بیرکردنەوە.

- عەلە ئێختە پیاوێکی بەتین و تاقەت بوو، خەڵکەکە دەیانگووت:

"باری ئێسترێك بە کۆڵ هەڵدەگرێ"

ڕۆژی بارانەکەی هاتەوە یاد:

دوا ڕۆژی مانگ بوو، ژمێریار لەژێر چادرەکەوە ڕۆژانەی کرێکارەکانی دەدا، ئاغای گوند باری ئێسترێك دیاری بۆ ژمێریارو "کەندێر" و ئەوانەی شار ناردبوو ئێسترەکە لەنزیك "کامپ" لە قوڕولیتە چەقی!! بەستەزمانە بارەکەی گران بوو. بارانیش تەختاییەکەی پێش کامپی کردبووە قوڕێکی قوڕەبەگ، ئێسترەکە دوو هەنگاوی لەناو گۆڕەپانەکە نان و هەتا گۆزینگان لە قوڕ ختم بوو.

کرێکارەکان لێ کۆبوونەوە ئێستریان بۆ لە قوڕ ڕزگار نەکرا.

حەمەچاوەش، چاوە مۆنەکانی لەعەلە بڕین!! وەکو قسەکەی عەلەی هاتبێتەوە یاد کە بە ژمێریاری دەگووت:

- قوربان مادام ئێختەم و بەئێختەم دەزانن! بۆچ ڕۆژانەی

حەمە چاوەش چاوێکی لە عەلە هەڵتەکاندو بانگی کرد:

- دەی ئێختە بتبینم مەرج بێ.. ئەگەر ئێستر و بارەکەت لە قوڕ دەرهێنان، مەرج بێ وابکەم ڕۆژانەکەت پتر بکرێ.

عەلە لە قسەکەی حەمەچاوەش دوودڵ بوو، بۆی ڕوون ببووەوە کە ئەم لەگەڵ درۆ جمکن. لەجێگاکەی ئەجووڵا، تا ماوەییك سەیری ژمێریار و کرێکارەکانی کرد.

عەلە چاوی تێکەڵ چاوەکانی‌ژمێریار بوون..

ژمێریار بەڕووی عەلە گەشایەوەو سەرێکی لەبۆ هەژاند.

عەلە لە بۆ ئێسترەکە چوو.. لەپڕ تێی ڕووبوو.. لەناو قوڕەکە بەرزی کردەوەو هێنای لە بەردەمی ژمێریار لەپێش زارکی چادرەکە داینا.

- کرێکاەکان دایانە هوڕاو چەپڵە، ئیتر لەو ڕۆژەوە ڕۆژانەی عەلە بوو بەپانزە عانە یەك ڕوپیە.

هێوارەی پێنج شەموش، کە لەگەڵ عەلە و تۆماو هاوڕێیەکانی دیکەی بەرەو گوندەکەیان دەگەڕانەوە، تۆما بەتەوسەوە بەعەلەی دەگووت:

- باوکم، ئەتۆ لە ئێمە گران و ماقووڵ تری! ئەتۆ پیاوێك و نیوی، ڕۆژانەی یەك تاکە گوێ درێژی بەڕێز وەردەگری!!

جەردە کە ئەم ڕووداوانەی بەیاددا دەهاتنەوە.. لەناوەوە وەك مەنجەڵێ یاپراخ دەکوڵا، بەپێکەنینێکی هیستیری هێورایی دڵی خۆی دەدایەوە.

دەیانگووت:

- ئاغای گوندەکە، بەدوو ئێستر و کوڕەکانیشی هەریەك بە بارگیرێك نووسراون!..

- عەلە ئێختەش بەیەك کەر!

وەلە خۆی پرسیەوە:

- ئەدی ژمێریارو حەمەچاوەش سەرۆکەکانی دیکەی کە لەشارن.

دەبێ ئەمانە، ئەم گەورانە حیسابی چەند کەرو ئێسترو بارگیریان بۆ کرابێ.؟

وەلەبەر خۆیەوە دەیگووت:

- کێ بە ڕۆژانەی کرێکای ئینسان ڕازی دەبێ؟

وە بەتەوسەوەو بەدەنگ گوتی:

- ە کوڕە دەور دەوری

قسەکەی گرتەوە، بێزی لەو چۆنیەتیە دەبووەوە، بەتوندی خوزیێکی فڕێ دایە بەرپێی خۆی، فێنکایی و هێمنایییەکی بۆ پەیدا بوو.

پتر ووریا بووەوە سەرێکی لە گوندەکە هەڵبڕی، گوێی دۆڵ کردن مەلا بانگەکەی تەواوکردبوو پتر هۆشیار بووەوە. شەو با لەدوورەوە قەبۆ قەبۆی کەوە وێڵەکەی دەهێنا و هەستی دەبووژاندەوە.

کاتێ گەیشتە ناو گوند، زوو بەزوو خۆی گەیاندە مزگەوتەکە.

دەرگای مزگەوت لەسەر پشت بوو.

- خەڵکی گوند، نوێژی بەجەماعەت لە مزگەوت دەکەن.

ئەمەی بەخۆ گوت.

هەندێك بۆ سەنگرایەوە، هەناسەیێکی خواردەوە فەرامۆشییێکی بۆ پەیدا بوو.

کاتێ پێی لە دەرگاگەورەکەی مزگەوت ئاوای ناوەوە کرد، هەموو ئەو فیکرو خەیاڵانەی تێی ورووژابوون.. هەمووی پەرت بوون ژووری مزگەوتەکە چۆڵ دیار بوو.

ئەمەی پێ سەیر بوو.

سەلەواتێکی هاویشت

ژوورەکە ڕەنگی هێوارەییکی درەنگی دەدایەوە.. چاوەکانی لە ژوورەکە تیژ کردنەوە.

بۆرایی سێ زەلام، لە گلێنەکانی چەقین!!..

سەری لەوە سووڕما کە لەسێ کەس پتر لەژووره فراوانەکەدا نەبوون!!.

- خەڵکی گوند، نوێژ لە مزگەوت بەجەماعەت دەکەن:

لەخۆی پرسی:

- کات وەختی نوێژی شێوانە.. دەبی بۆچ مزگەوت ئەوها چۆڵ بێ؟ سێ کەسەکە، دوویان لە ژێر پێی "مینبەر" ە دارەکە لێی هەڵتروشکابوون، ئەوی دیشیان لە جێگای مەلا لەناو "میحراب" لینگی لێ ڕاکێشابوون. جەردە بۆی چەمایەوە. خەریك بوو کاڵەکانی دابکەنێ، کە یەکێك لە سێ کەسەکان گوتی:

- مەلا نوێژی شێوان لەماڵی ئاغا دەکا!

جەردە لەگەڵ دەنگەکە هەندێك سڵەمیەوە: قسەکەی کابرای پێ عاجباتی بوو:

لەخۆی پرسیەوە:

- چۆن نوێژی شێوان لەماڵی ئاغا.. دەکرێ؟

هێشتا لەوەڵامێك دەگەڕا بۆ پرسیارەکەی، کە دووەمیشیان بەدەنگ بانگی کرد:

- دیارە ئەیزانیوە ئێمشەو هەینی‌یە

جەردە، بە واق وڕماویەوە لەخۆی پرسیەوە:

- چۆن شەوی هەینیان ماڵی ئاغا دەبێتە مزگەوت؟

لەتارمایی سێ کەسەکە وورد بووەوە، وای بۆ دەهات کە قسەکانیان ئاڕاستەی ئەو دەکەن.

ویستی ئەویش قسەییك بکا، بیری لەوە دەکردەوە کە چ بڵێ؟ کە کابرای سێیەمیان لینگی لێ هەڵکێشانەوە "شەمچەییکی" لێدا، جگەرەکەی پێ داگیرساند، دەستێکی بۆ چرایەکەی تەنیشتی درێژ کرد، بەڵام پێش ئەوەی" چرایەکە هەڵبکا شخارتەکە کووژایەوە.. کابراش بە خاوێیکەوە بەدەنگێکی ساردو شل گووتی:

- وای ئەوەی ئێمشەو لەماڵی ئاغابێ پارووی چەورە.

وەهەر سێکیان بەیەکەوە دایان لەقاقای پێکەنینێکی گڕو گەورەو پچڕپچڕ.

جەردە، بەهۆی ڕووناکیە کتووپڕەکەی شەمچەکە، کەلەشی سێ کەسەکانی چاکتر بەدی کردن، زەلامەکانی وەکو بیانی هاتنە بەرچاو! دیمەنیان جیاوازێکی زۆری لەگەڵ دیمەنی خەڵکەکەی تر هەبوو! کۆمەڵێك بیری ئاڵۆزی بۆ هاتن، سامێك خۆی بەسەر مێشکیدا سەپاند بەڵام بەزوویی خۆی لەو بیرانە دوورخستەوە، لەگەڵ

دڵساردییەکی زۆر ونەرمە ترسێکەوە خۆی لەقسەو چۆنیەتی سێ زەلامەکە گێل کرد بیسملاییەکی خوێند، بەپەلەپەل پێڵاوەکانی بەسەرپێ کردنەوە بۆی کێل بوەوەو بەجۆرێکی ئالی سوورپایەوە، کاتێ لەزاری مزگەوتەکە دەردەپەڕی بەدەنگ بەخۆی دەگوت:

- پیاو کەشەو کەوتە ڕێگاو سەفەر خۆی گیرنەکا باشە!!

ملی ڕێگای گرتەوە

گوندەکەی.. بەجێهێشت..

بەگورجی بەگردەکە هەڵدەگەڕاو بەرەو گوندەکەی خۆی ڕێگای دەپێچایەوە.

بەتیژی چاوی لەبەر پێی خۆی بڕیبوون. لەگەڵ ئالۆزیو سەرسامیەکەشی، قۆرتو کۆسپەکانی ڕێگای بەچاکی بەدی دەکردن، لەمێشکی خۆی قسەی کابرای مزگەوتەکەی دەجوورتەوە:

- ئەوەی لەماڵی ئاغابێ پارووی چەورە.

سووی لەوە نەبوو کەلای ئەدایە دیوانخانەی ئاغای گوند

سەرێکی هەژاند، وەکو بیەوێ مێشکی هەڵتەکێنێو لەو خەیاڵ و بیرانە پاکی بکاتەوە.

ڕووی بەرزکردەوە، لەبەر خۆیەوە مرتاندی:

- باشە مانگەشەوە، دەنا چۆن بەتاریکی دەگەیشتمەوە ماڵ؟

هێشتا بەهەورازەکە سەرنەکەوتبوو، هەستی بە برسیەتیێکی زۆر کرد رووی بۆ ئاسمان هەڵبڕی، شەوێکی کشوومات بوو.

ئاسمانی ئەو شەوە، بە دەریاچەییەکی لێوار خوارو خێچی شین و ساف دەچوو.

مانگ وەکو کولیچەییەکی گەورەی زەرد لەناوی‌دا مەلەی دەکرد!.

خوزیێکی قووت دایەوە:

- هەینیەکەی پێشوو چوار سینی کولیچەی ماڵی مودیر بەگی بردنە فڕنەکەی وەستا ڕەفیق نانەوا

جەردە، ئەمەی وەبیر خۆ هێنایەوە.

- کە کولیچەکانم بەسوور کراوی بردنەوە، خانم هەردوو باخەڵی پڕکردم لە کولیچە!

- منداڵەکان لە خۆشیان دا شاگەشکە بوون.

- هەتاوەکو ڕۆژئاوا سێ و دوو هەڵپەرکێیان لەگەڵ کولیچەکان دەکردن.

تارمایی بزەیەکی باڵشکاو لەسەر زاری هەڵنیشت:

- من و ئایشۆکیش هەر یەکەمان چوارمان بەرکەوتن.

کە وێنەی ژنو منداڵەکانی لەخەیاڵدا دووبارە بوونەوە هەستی بە غەریبییەکی زۆر کرد.

بزەکەی لەسەر لێو هەڵفڕی و کوژایەوە.

کانی سۆز و خۆشەویستی لە دەروون دا هاتە کوڵین و هەڵچوون.

دەستێکی بۆلای ڕووی بەرزکردەوە.

بەتیی دەستەکەی و بەلاچکی چۆخەڵەکەی، نیمێکی لەقولینچکی چاوەکانی ووشك کردنەوە.

- کاتێ.. لەشکرەکەی دوژمن بەسەر شوڕی و بەزیوی لەگوند کشایەوە، باوکی دۆزیەوە.

دونیا قات و قڕی بوو. لەگەڵ باوکی بەرەو کوێستان سەرکەوتن.

لەوديو دەچینە ماڵی مامت، هەتا خودا دەرگایەکمان لێ دەکاتەوە.

- باوکی ئەوهای پێ گووت

- لەو دیو لەماڵی مامی، لەگەڵ ئایشەگوڵی ئامۆزای پێکەوە گەورە بوون.

- هەتا گەورەش دەبوون پتر هۆگری یەکتری دەبوون.

- بەهاران لەگەڵ کوڕو کیژانی گوند دەچونە ڕێواس کردن.

- هەر جووتە یارێك، باسکیان لەباسکی یەکتر دەئالاند و لەو کێو و هەڵدێرانە لەگەڵ کێوی. لەگەڵ قەلەندۆرو ڕێواس و ترشۆکە و گیاو گوڵی بەهار ڕۆژیان بەرەو ڕۆژئاوا گەوز دەدا

- پایزانیش، پێکەوە بەکۆمەڵ و جووتە بەناو دارستانەکان بۆ مازوو چنین بڵاودەبوونەوە.

- لەو سەیرانانە، بەدەستازی وچاوبازی بەڕاونانی یەکتری و گەوز گەوزانێ مێرگەکانیان دەبووژاندنەوە.

جەردە خوزیێکی تامەزریی قووت دایەوە

- ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی تەمەن بوون بەهاری تەمەن بوون.

- هەرگیز تام و بۆی ئەو ڕۆژانەی لەناو خوێن و مێشك، لەناو دەروون دا ناچنەوە.

کەوتەوە ناو شەپۆلی یادگارەکانی:

- لەگەڵ ئامۆزاکانی وەردو شۆی زەویەکانی دەکرد دەیان کێلان تۆیان دەدان.

بەزۆری گەنمە بەهاریان دەچاند.

- ماوەییەك شوانی مەڕو ماڵاتەکەی مامیشی کرد.

- لەگەڵ شوانەکانی گوند لەو کوێستانانە وەلساتی دەچەلاند.

- نیوەڕۆیان بۆ بێری دەگەڕانە سەرچاوەکەی ئاقار.

- لەژێر دار بەڕووەکان، ئاژەڵەکانیان مۆڵ دەدان.

- ئایشە گوڵ شەنگە بێری‌وانی ئەوبوو

- ببوە هەرزەکایێکی پڕ خوێن و ئارەزوو، کەڕۆژێك باوکی پێی گوت:

- کوڕم ڕەشۆ، خوای گەورە، تۆو ئایشۆکی ئامۆزای بۆ یەکتری خوڵقاندوون.

وە پێی گوت:

- ئێوە ئامۆزای یەکن، لەیەك دەمار و خوێن دروست بوون، لەیەکدی دەوەشێنەوە.

- ڕوومەتەکانی ئایشە گوڵ سوور هەڵگەڕابوون.

- سینگی هەندێك بەرزتر دەهاتە بەرچاو.

- مەمکەکانی خڕ کردبوون.

- وەك چووزەرە سەریان هەڵدابوو.

- ڕکەیان لەگەڵ کراسە خامەکەی دەکرد.

جەردە ئەو کاتو ساتەی لەبیر نەمابوو کە لەناویدا دەژیا!!!.. گەڕابوەوە سەردەم و ڕۆژانی هەرزەکاری.. هەناسەییەکی پڕ فەرامۆشی خواردەوە.

گەڕایەوە ناوەوەی خۆی:

- مام و مامۆژنم، ئەوانیش پێیان خۆش بوو لەگەڵ ئایشۆك ببینە هاوسەری یەکدی.

بەبێ دەستی خۆی، دەستێکی وەڕووی خۆی دامێنا، لاجانگی بەپەنجەکانی خوراند، وەکو بیەوێ وێنەکانی ڕابووردووی ئەو سەردەمەی لە خەیاڵدا ڕوونتر بکاتەوە:

- کە دونیایەکەش دامەزرایەوە شەڕوشۆڕو قاتی دوایان پێ‌هێنات، دەستی ئایشەگوڵی بووکی گرت و لەگەڵ باوکی شەوێك لەسنوور ئاوابوون، گەڕانەوە گوندە جوانەکەی خۆیان.

لەوکاتەی کاك ڕەشید ئەو دیمەنانەی دەجوورتنەوەو لاپەڕەگرانەکانی ئەو ژیانە ڕابووردوەی هەڵدەدانەوە.

ئەوکاتە لەتەنیشت گوندی "کاوانیان" ڕادەبوورد.

سەگوەڕێکی گەرم و درێژ









و دڕ هۆشیاری کردەوە، هەستی بەچۆنیەتی ئەو کاتەی کردەوە، سەرماییکی پایزی گەزێنەر لەشی گرژکرد هێزی دایەوە بەرخۆی، هەنگاوەکانی گورج ترو بەرین ترکرد، بەنیمچە ڕاکردنێك دەچووە پێش.

سەگوەڕ.. بەبێ پسانەوە پەردەی گوێچکەو هەستی دەوڕووشاند، کە ملیشی بە هەورازەکەی ڕۆخ گوندەکەوە نا.. هەستی بە برسیەتییکی زۆر کرد.

لێی گران هات لابداتە گوندەکە.

بەخۆی گوت:

- میوانێ.. ناوەخت ئێسکی گرانە.

وەلێکی دەدایەوە:

- پێویست ناکا لابدەم.

- هەرسەعاتێکی دیکەیەو دەگەمەوە ماڵ.

لەپاوانەکەی ئەوبەر گوند، کۆمەڵە ڕەشماڵێکی بەدی کردن.

ئەو هۆبەیە.. پاشەنگی ئەو کۆچەرانە بوون کە لە کوێستانەوە بە "دەشتی هەریر" و "ماوەران" و "زیبارۆك" دا بەرەو هەوارە زستانی ناوچەی "زراری" و گەرمیانی "بەحرکە".. دەگەڕانەوە.

هەتا پتر بەهەورازەکەدا سەردەکەوت، سەگوەڕەکە توند و تیژتر دەبوو. سەگەڵ هۆبەکە هەستیان پێی کردبو. هەتا دەو شێوەکە. هالاویان بۆهێنابوو. خاوەنەکانیان بانگیان دەکردن هێوریان دەکردنەوە. دەنگە دەنگی ئەمانەتێکەڵ بەبۆڕەی ڕەشەوڵاخ" و فرمەی "بەرزە" و بارەباری وەلسات دەبوو. و دەڕژایە ناوتاریکایی ئەو شەوە تا لەبنار سەفین دووبارە دەبووەوە. لەگەڵ خۆیەوە گوتی

- وای بەران و کاوڕو بزن و کوورو سەنگوی قەڵەویان لەلا چەنگ دەکەوێ

- لە کوێستان لەوەڕاون. ئێستا هێلکە لەسەر پشتیان ڕادەوەستێ

- دەوڵەمەندەکانی شەقڵاوە جوانەگای بێ نیشان بۆ قوربانی لەمانە دەکڕن.

وە بەراوردی خۆی دەکرد:

- ئەگەر مانگانەکەم وەرگرتبا، بەشی ئەوەشی دەکرد پیرە بزنێك بۆ منداڵەکان بکڕم.

ئەرمە ئاهێکی هەڵکێشاو خووزییکی تامەزرۆیی قووت دایەوەو هەنگاوەکانی خۆشتر کردن.

ئاقاری گوندەکەی بەجێ هێشتبوو، کەهێشتا بۆی نەدەکرا مێشکی خۆی لەو خەیاڵانە بشواتەوە.

هەر مگێزی دەگێڕان و یەکوو دووی دەکردن:

- ئەگەر ڕۆژی شەمووش مووچەکەمان بدەن دەتوانم جەژنەییك لەگەڵ خێزانەکەم بکەم، کە وەجەژنان بچێ!!

- بەلام کەنگێ جەژنەییکی وەکو جەژنمان کردووە؟

لەخۆی پرسینەوە:

- لەوەتەی هەرزەکارم لەوەتەی لەگەڵ ئایشۆك، لەوردیو گەڕاینەوە.. ئەمان زانیوە تام و ڕەنگ و بۆی جەژن چییە؟

بیری بۆ ئەوە چوو، هەر کە گەیشتەوە ماڵێ، لەگەڵ ئایشۆکێ پەل منداڵەکان بگرن‌و بۆ ئەودیو، بۆماڵێ مامی ئاوا ببنەوە.

- لەم دەردی سەری و ئالەبارییە ڕزگارمان دەبێ.

- بەلام چۆن دەتوانن؛ بچنەوە ئەو دیو؟.

لەخۆی پرسی:

- ئەم ڕۆژانە ڕۆژی ترن؛ ڕۆژی پڕ سام و ڕەشن.

- لەگەڵ هەر هەنگاوێکیان لەتەلەییکی ئاگرین هەڵدەنگرون.

- دەرگای ماڵ لەماڵخۆ لۆك و زنجیرکراوە.

وەلەگەڵ ئاهێکی قووڵ لەگەڵ خۆی دەیپرسی:

- کێ دەتوانێ خۆی لەم خەتی لەعنەتە بدا.

- ئەو دەستکردی شەیتانە.

سەرێکی هەڵبڕی، دەیەویست خۆی لەو بیرکردنەوەیە گێل بکا، هێزی دایە خۆی بەگوڕتر ڕێگایەکەی دەپێچایەوە.

ئەوکاتە.. گەیشتبووە "سەرمەیدان" ی شەقڵاوە بۆنی گوندە خۆشەویستەکەی کرد.

ئاگرەسیسەکانی ماڵەکانی گوند، لە دوورەوە تێکەڵ بەچاوەکانی دەبوون.

پتر ووریا بوەوە.

فەرامۆشیێکی پەڕیە دڵ..

لەگەڵ هەناسەییکی توندو بەجۆش، هەموو ئەو ئاوات و مگێزانەی هەموو یادگارە دژوارەکانی.. هەموو گلەییەکانی هەڵدانە دەرەوەی سنووری مێشکی.

- ئەهـ ها ئەوا گەیشتمەوە ماڵ.

هەناسەیێکی نەرم و فێنکی، ڕەکیشی سیپەلکەکانی کرد.

خۆشیەك دەروونی گرتەوە.

لەشی سووکترو هەنگاوەکانی گورجتر بوونەوە. گوراحێکی هاتەوە بەر.

تەنها لەوە دڵگیر بوو.. کە ئەوها بەدەست بەتاڵی دەگەڕێتەوە ناو خێزانەکەی.

- بەلام چارچییە، بەشی ئێمە ئەمەندەیە!!.

ئەوها دڵی خۆی دەدایەوە.

چاوەکانی لەڕێگا ڕەشەکەی بەرپێ چەسپاندبوون، بە هەنگاوی کورت و درێژ، بەرەو گوندەکەی دەچووە پێش.

حەزی دەکرد زووبگاتەوە ناوخێزانەکەی هەتا لەو فیکرو خەیال و کابووسانە ڕزگاری ببێ.

ئەم حەزەی لەناوەوەی دەنگی دەدایەوە:

- ڕۆژی دووشەممە، دەبێتە جەژن

- هەتا ئەو ڕۆژەش خودا.. یەکەو دەرگای هەزار سەرێکی بۆ سەفین بەرزکردەوە.

پیرە سەفین. سەری بەسەرسینگیدا، کەچ کردبوو. سیبەرەکەی هەتا ناو قەدی داپۆشیبوو.

شێو و دۆڵەکان باوێشکیان دەدا.

تەراش و دەوەن.. کەفرەکان.. لەژێر تیشکی مانگەشەو سەریان بەیەکەوە نابوو، دونیاییکی خامۆش و بێ هەست و بێ جوڵە بوو.

لەو دونیا بەرینەدا لەو شەوە بێ هەست و چرپەیەدا لەو پتر نەدەجوولایەوە.

لەگەڵ خۆی دا دەیگووت:

- ماشەڵڵا عالەمێکی سست و کەڕ و لاڵە

- ژیانێکی بێدەنگ و بێ ڕەنگ و دەنگدانەوەیە.

ئەو وەختە لەخوارەوەی "بەردی کونتی" تێدەپەڕی، کەلە پڕ گوێی لە دەنگێك بوو!!.

وەکو باوەڕی بەگوێی خۆی نەکردبێ، هەندێك هێواش بوەوە.. هەستی ڕاگرت

- مئە ئە.. ئە ئا.

گوردێکی تێ ڕووهات!!!.

بەبێ دەستی خۆی، ڕووی بۆلای دەنگەکە سووڕاندەوە.

ویستێکی کرد

- مئە ئە ئە ئا

لەدڵی خۆیدا گوتی:

- ئەوەی بزنە

- دەبێ بزن بێ.

هەستی لەخۆ بڕی بە ئاستەم جووڵەییکی کرد، چاوی بە ئەم لاو.. ئەولای خۆیدا گێڕان، لەشی پتر جولاندەوە.

چەند هەنگاوێك، بەرەو بەردەکە بۆی هەڵکشا

دیسان چاوی بەهەموو لاییکی خۆیدا گێڕانەوە، بە ووردی.. بەچاو ئەوناوەی پشکنی بەلام چ شتێکی سەح نەکرد!!.

بۆی داهاتەوە، دەستێکی بەزەویەکەی‌بەرپێیەکانی داگێڕا، کوچکە بەردێکی هەڵگرتەوە، لەسەرخۆ هاویشتیە تەراشەکانی دەوروبەری.. بەخۆی گووت:

- لەوانەیە خۆی لەناو تەراشێك حەشار دابێ.

کوچکە بەردێکی دیکەشی هاویشت گوێی دۆڵ کردن و هەستی ڕاگرتەوە.

- مئە ئە.. ئە. ئاع.

دڵی کەوتە کوتان؛ یەقینی هات کە دەنگی بزنە!!.

- ئەرێ وەڵڵا بزنە و بزنیشە!

- هەبێ و نەبێ، لەشوانێك بەجێ ماوە.

- بەلام شوان لەم ئاقارە چ دەکەن؟

- تەنانەت "ڕەوەند"یش بەم کەرخەدا ڕانابوورن.

لەناوەوەیەوە بەم ڕەنگە لەگەڵ خۆی دەدوا..

بەپەلە و پەشۆکاوی.. بەگوێ ئەو شوێنەی دیار کرد کە دەنگی بزنەکەی لێ دەهات.

ماوەییکی تریش بۆی هەڵکشا تاوەکو لەبەردە زلەکەش تێپەڕی.

چاوی بە هەموو کەندو کۆسپ و قۆرت و قۆپەنە تەڕاش و دەوەن بەهەرچوار لای خۆیدا گێڕان بەلام چ بزنی نەدۆزیەوە!!.

بەسەرسامییکەوە هەندێك بۆی وەستا هەستی ڕاگرتەوە، دونیاییکی بێ هەست و دەنگ و ڕەنگ بوو!!.

سەرێکی لەقاند لەبەر خۆیەوە مرتاندی:

- ئەدی چی لێ هات؟

- خۆزەوی قووتی‌نەدا!!.

- پاش بیرکردنەوەییکی کەم بەخۆی گوتەوە:

- هەبێ و نەبێ خۆی لەناو تەڕاشێك مات کردووە.

یەك دوو هەنگاوی تر سەرکەوت..

لەجێگاکەی ڕۆنیشت وەکوو بێتە بۆسە..

وەها خۆی‌مەلاس دا و هەستی ڕاگرتەوە.

- مئە ئەئە ئە ئاع

بزنەکە لەلای چەپەوە بەئاوازێکی‌زەنگوولی بەسۆز بانگی کردەوە.

بەگورجی ئاوڕێکی بۆلای چەپی دایەوە.

هەندێك ملی بۆ هەڵکێشا تارماییێکی بۆر لەسەر "گردی زەیتوون" تێکەڵ بەلێڵایی چاوی بوو.

جەردە هەناسەیێکی هاتەوە بەر لەسەرخۆ بۆی ڕاست بووەوە بەتیژی چاوی لەتارمایی بزنەکە ئاڵاندن.

گیسکێکی گەورەی بۆریوو لەناو گۆڕستانەکە لەسەر کێلە بەردێکی زەلام قیت لێی ڕاوەستابوو.

چاوەکانی هەڵپشارتن.. نەفەسێکی توندی پڕ بەسپەلکەکانی هەڵکێشا لەو کاتەدا.. هەزارو یەك خەیاڵی.. لەمێشکی، لەدەروونیدا وورووژان.

بەخۆی گوت:

- دەیبەمەوە، هەتا جەژن ئەم چەند ڕۆژە بەخێوی دەکەم.

- ئەگەر خاوەنێکی لێ پەیدا بوو دەنا، بەخێری خاوەنی بۆ بچووکان دەیکەم بەچێشتی جەژن.

وەکو لەناوەوەی شکی لەخۆی و گومانی لەقسەکەی پەیدا کردبێ، بە نابەدڵی و بە دەنگێکی بڵند دوا:

- هەر خوداش بەوەڕازی نابێ.. لێرەکانە وازی لێ بێنم.

ببێ بەخۆراکی گورگ و کەمتیار!.

ئەم لێکدانەوەیەی جۆرە هێمایی و کامەرانییێکی پێ بەخشی، بەپێدزە.. بۆ سەرووی گۆڕستانەکە سەرکەوت هێندی هێندی پارێزی بۆ گیسکەکە برد، لەپەنا دەوەنێك خۆی مەڵاس دا ماوەیێك هەستی ڕاگرتەوە. گیسکە بۆر.. قیت لەسەر.. بەردە کێلەکە دامەزرابوو، ئاگای لە جووڵانەوەی جەردە نەبوو، جەردە بەکاگۆڵە بۆی چوو.. هەتا خۆی گەیاندە نزیك کێلەکە، لەپڕ پەلاماری گیسکیدا، بەڵام گیسکە بۆر لەو گورجتر بوو، هەردوو گوێی ووشت کردن و بەفرتکێکی بەرین خۆی لە کێلەکە هاویشت و بەبازو فرتك بۆی دەرچوو.. بۆ ئاودۆڵەکە شۆڕبوەوە، جەردەشی لەسەر دەم خستە ئەو مەیدانە.

جەردە بەپەلە هەڵستایەوە، نسکۆیێکی برد، بەڵام خۆی گرتەوە بەڕاکردن سەری ڕەدوو گیسکەکە نا لێرەها لێرە.. تاکو لەسەر "گردی ئەسحابان" دۆزیەوە، لەپەنا بەردێکی گەورە چاوی بەم کەوت:

- منە.. نە نە نا

دەستی پێ کردەوە!!.

جەردە بەهەناسەبڕکێ و تەنگاوی لەجێگاکەی چەقی، چەند دانێك چاوەکانی لەگیسکە بۆر بڕین!! گیسکە چاوی کوسك دەکران و دەبریسکانەوە.



جەردە هەناسەی هاتەوەسەرخۆ دەستێکی وەسەر و گوێلاکی خۆی دا هێنا پاش بیرکردنەوەیێك لەبەر خۆی مرتاندی:

- گیسك بیڕێنە بەزاتی خوا، بەفێڵ نەیگرم.. ڕوحم دەردێنێ.

گوێی لەبانگی گیسکە.. کەڕ کردن، دەیەویست گیسکەکە هەڵخەڵەتێنێ

ماوەیێك گوێی بۆی وەستا.. هەناسەیێکی درێژی خواردەوە، مێشکی ساف کردەوەو.. بەتیژی دوور لە گیسکەکە تێپەڕی هەتا تەواوێك لێی دوورکەوتەوەو لەبەر چاوی وون بوو، تەنانەت ئاوڕێکیشی لێ نەدایەوە.

- نە نە نا.. نانا.

گیسکەکە بانگی کردەوە، وەکو پێی بڵێ:

- ها.. جەردە بۆکوێ ئەوا من لێرەم!.

گیسکەکەش دەیەویست سەرنجی جەردە بۆلای خۆی ڕابکێشێتەوە!!

- وەی ڕەششاو!

- بەگۆڕی ئەم ئەسحابانە دەبێ بۆ جەژن بتکەم بەقاورمە، بەڵام بۆم ڕاوەستە.

- جەردە بەم گڕوگەفە وەڵامی گیسکی دایەوەو بەچووستی بۆی سووڕایەوە.

تیرەی بەست وەك بروسك خۆی تێ کرد. لاقێکی کەوتە دەست، گیسکی بە ئەرزەکەدا کێشاو خۆشی بەڕوودا کەوت و سەرو شەدەی پەڕینە ئەو گۆڕە. لەگەڵ گیسکە کەوتنە گەوز گەوزانێ و بگرە و بەردەو زۆرانێ، جەردە دەیەویست بەدەستەکەی دیکەی، دەستێکی گیسکەکە بگرێو زەبتی بکا، بەڵام بەپەلەقاژێو حەولە حەول خۆی لەبەردەست ڕاپچکڕێو وەك ماسی لەژێر دەستی جەردە دەرپەڕی!!، بە هەڵبەز هەڵبەزو ڕمبازی بناروبنار بۆی دەرچوو.

جەردە هەناسەی تەنگ ببو، بەوشەوە سارده، هەموو لەشی بەسەر ئارەقەدا گەڕابوو، بە ڕکێکی زۆرو بەهەناسە بڕکێ بەسەر خۆیدا نەڕاندی:

- هەی.. دەستت بشکێ.. هەی!!.

- ئەوە چۆن لێت بەربوو؟.. نا !!.

هەڵستایەوە سەرچۆکان، سەرو شەدەی توند کردنەوە، پشتێندەکەی گورج تر کرد.. بەهەردوو

دەستی بستێك دەلینگی ڕانکەکەی هەڵکردنەوە، خوزێنکی لەبەری دەستی خۆی هەڵسووی.
ڕاست بوەوە تیتی دایەوە خۆی. بەڕاکردن کەوتە دوای گیسکە بێعارەکە.. وەك جنۆکە، لەسەر بەردودارو.. دەوەنی بنار شاخەکە هەڵدەقۆزایەوە!! جار جارەش لەسەر کەپکێك هەڵدەترووشکا، ناوڕێکی گوشتی لە چەردە دەدایەوە! وەکو بانگی بکا:
- چەردە.. چەردە.. خۆت تەنگاوەمەکە.
- نا.. ناوەتەم.. ئەوەتەم!!.
چەردەش، بست وبست، بەهەموو هێزیەوە.. بەدوای‌دا.. دەبەزی.
ڕاوی دەنا..
بەسەر دارو بەردو تەڕاشەکان بازبازانێی دەکرد
هەتا بۆسەر "گردی باویان" پەڕینەوە.. هێشتا تارمایی گیسکی لەچاودا چەقیبوون.
کاتێ گەیشتە سەرگردەکە، چەردە هەندێك هێواش بوەوە.
بۆی سەنگرایەوە.
بەگوێ پێخۆستی گیسکەکەی هەڵدەگرت.
چاوی.. بەهەموودەورووپشتیدا دەگێڕان، بەنەرمە ڕۆیشتنێك ئەو ناوەی ئەمسەر و ئەوسەرکرد.. بست بەبست پشکنی.. سەیر گیسکە بۆری وون کرد!!
گیسکە بۆر بووە پاروە نانێك و کەوتە گەرووی ئەوشەوە!!
ئەم لاگیسك ئەولا گیسك!! ئەخێر گیسکی چی و.. نیسکی چی؟ وەکو هەرگیز گیسکێك لەو بنار سەفیتە ڕانەبووردبێ!!.
چەردە هەندێك بۆی وەستا، بۆ ئەوەی بە هەناسەیێکی‌سارد.. دەروونی فێنك بکاتەوە.
خەمێکی قورس وەك لێشاوێکی جیوە ڕژایە نێو گیانیەوە، دۆڕاوانە دەستەکانی لەیەکتری دان.. وەکو بەزیو.. چوو لەسەر گرمتێك دانیشت، بەناهومێدی سەری خستە ناو دوو لەپی دەستی، بیری لەوە دەکردەوە کە بەو شەوە سارده پتر خۆی ئازار نەداو دەست لە گیسکەکە بشوا.
- کێ بەم شەوە ساردە دەیدۆزێتەوە؟
چەردە بەداخێکەوە لەخۆی پرسی.
خووزێکی بۆ دوورەوە تێ هەڵدا، دەستێکی وەدەم و لووتی داهێنا.. سەرو شەدەی باشتر ڕێك خستنەوە، لەسەر گرمتەکە هەڵستایەوە.. دەستێکی لە پشتبێندو لەنیفۆی ڕانکەکەی خشاندن:
- ئۆ.. ۆ و.. ف ف
- هەناسەیەکی توندو درێژی هەڵمژی و لەسەر گرمتەکە هەڵتروشکایەوە، سەری لەمانگ بەرزکردەوە
ڕووی مانگی ئەوشەوە.. تەمێکی بۆری بەسەردا کشابوو.. دەتگووت کولێرەیێکی لاقرتاوە.. ڕووە زەردو تەماویەکەی هەر وەڕەنگی ڕووی کچێکی ماندوو و.. برسی دەچوو. پەرۆشی و جوتبوشێك لەناوەوەی هەڵ بوو..
بەخۆی گووت:
- هەر وەڕەنگ و ڕووی ئایشۆکی دەچێ!!.

هەناسەیێکی دیکەی خواردەوە.. بە وەڕسییێکەوە لەگەڵ خۆی کەوتە مشووری ئەوەی چۆن خۆی لەم گێژاوە ڕزگار بکا!! و بەساغ و سەلامەتی بگەڕێتەوە ناو ماڵ و منداڵەکانی.
بەخۆی گووت:
- لەسەر گردی باویان بۆ "دەنگارە" شۆڕ دەبمەوە ناوگوند.. خوداش ڕەززاقی ماروو، مووره
- دیارە خودا ئەیکردوە بەڕسقی من..
لەجێگاکەی هەڵستا، هەندێك خۆی لەتۆزو گەرد داکوتا.. یەکەم هەنگاوی نا.. تا بەرەو دەنگارە دابەزێ.
- منە.. ئە.. ئاع ع..
گیسکە بۆر، لەناو تەختانییەکەی ڕۆخ "کونە جنۆکە" سەری لە پووشەکەی بەردەمی نابوو دەلەوەڕا!!.
چەردە زۆر تووڕەبوو.. بەڵام داتی بەخۆیدا گرت، تەنانەت ناوڕێکیشی لە گیسکەکە نەدایەوە!.
بەدەنگێکی.. پچڕپچڕ.. لەبەر خۆیەوە گوتی:
- وەی سندان.
- بڕۆ هەی بەدفەڕ.. بڕۆ کارم پێت نییە!!.
بەڵام کە ئەمەی بەخۆی دەگوت.. هەموو ئەویەك و دووەی لەسەر گرمتەکە لەگەڵ خۆیدا دەیکرد.. هەمووی فەرامۆش کردن.
لەخۆشی دۆزینەوەی گیسکەکە.. هەمووی بیرچوونەوە!!
بیری بۆلای گیسکەکە گەڕاندەوە.. خوزێنکی قووت دایەوە، لەناو مێشکیدا خەریکی دانانی پیلانێك بوو.. بەسەررووی ئەشکەوتەکە سەرکەوت.
بەئەسپایی پشتێنیدەکەی لە ناوقەدی خۆی کردەوە قولف قولف هەڵی کردەوە، قولفێکی گەورەی لەسەرێکی‌دا.. سەرەکەی دیکەشی دیسان لەناوقەدی قایم کردەوە.
دوو هەنگاو بەبێ خشپەو بەجۆرێك کە گیسکە هەستی پێ نەکا، بۆی چوەپێش.. ئەمجا بەگوڕ بەهەموو هێز و توانایێکی لەبەری دامابوو. پەلاماری گیسکی دایەوە.. بۆی سووڕایەوە خوا چاکی بۆهێنا.. قولفەکە لەملی گیسکە بۆر ئالا
گیسکی گرت
هەناسەیێکی گەورەو پڕجۆشی خواردەوە، بەپەلەو بەرکێکی زۆرەوە.. چووە سەر گیسکەی لەو گۆڕەدا چوار پەلی لەخۆ.. هاویشتبوون.
خۆی لەبەر دەستەکانی چەردە گێڕ و شل کردبوو!! دەمی بستێك لێك هەڵچڕی بوو، وەکو ساواییێکی‌زیزۆزوێر پەلی دەکوتان و لە قاپڕنی دەدا، بەڵام کە دەستی چەردەی گەیشتێ زوو ژیرو هێدی بوەوە.
چەردە چۆکی لەسەر پەراسووی گیسکەکە دادان.. هەندێك لێی ووردبوەوە، چاوەکانی گیسکە بۆر زەق و لەبەر شەوقی مانگەشەو، وەك دوو کەلاشووشەی فۆسفۆری.. زەرد.. زەرد، دەبریسکانەوە.. کەچاری تێکەڵاو چاوەبریسکەدارەکانی بوو، پتر تووڕەو دەهری بوو.
ئارەزووی دەکرد هەر لەو جێگایەدا کێردی لەمل وەربێنێ، بەڵام کەڕاستی کردەوە، دەستێکی بەلاتەڕۆك و پشتی داهێنا.. گیسکێکی زۆر بەگۆشت و قەڵە.. و.. پوخت بوو.
ڕکەکەی خواردەوە.. کەللەی ساردو دەروونی ئارامی گرتەوە، وە تارمایی بزەیێك لەسەر لێوەکانی لەرزینەوە، بەخۆی گوت:
- ماڵی خاوەنی ئاوابێ.. دەڵێی دایبەستووە هەناسەیێکی درێژ درێژی هەڵمژت.
چەردە.. بەم ڕاوە ئاوەختە زۆر دڵشاد بوو، گوراحی.. هاتەوەبەر، لەگەڵ خۆیدا مشووری ئەوەی دەکرد کە چۆن گیسکەکە بگەیەنێتەوە ماڵ!.
ئەووەل جار بڕیاری لەسەر ئەوەبوو کە بیداتە پێش خۆی، بەگەلی دەنگارەدا شۆڕببێتەوە ناوگوند.. بەڕۆخ مزگەوتی گەورەدا بە ڕێگای "گیبرە".. بەرەو ماڵ ببێتەوە، بەڵام زوو ئەم پلانەی لە مێشکیدا سڕیەوە کە لەدڵی خۆیدا لێکی دەدایەوە:
- لەوانەیە، کۆلکە مەلایێك.. وشکە سۆفیەك.فەقێیەك.. لەبەر دەرگی مزگەوت.. یان کەسێك لەگوند بمبینێ و مەسەلەکە ئاشکرابێ!.
ئەوەشی بەبیردا هاتەوە کە:
- پۆلیس و شەپان.. پیاوەکانی ئاغا، بۆ ڕاو ڕووت خۆیان لەو ڕێگایە.. یان لەسووچەکەی مزگەوت خۆیان لەحەشار دەنێن، شەڕ بەڕێبوار دەفرۆشن.
وەبەخۆی گوتەوە:
- باشتر ئەوەیە لەخوار "کەندەکۆخ" ەوە پشت گوندو.. پشت گوند بچمەوە چاکی "خەزوولاس" ێ.. لەوێشەوە بەبەر "گردی دێرێ"دا بۆ "کەل زەیتان" بەرەو "تەم تەم" شۆڕببمەوەو.. بناوان بناوان خۆم بگەیەنمەوە "زێوەر"
چەردە.. ماڵی لەگەڕەکی.. زێوەر بوو.
ئەم ڕێگایەی تەواو پەسند کرد، بە ئاسانی بڕیاریشی.. لەسەردا.. لەگەڵ گەیشتنە ئەم بڕیارەش جۆرە فەرەحنایێك ڕژایە گیانیەوەو.. دڵی لەخۆشیاندا دەلەیزی.. کەبیری‌دەکردەوە:
- وای بابە.. هەرکە لەگەڵ گیسکەبۆر دەگەمەوە ماڵ.. وای منداڵەکان.. باش لەخەر ڕادەپەڕێنم!.
- ئایشۆکیش گوریسەکە دێنێ.. وملی گیسکەبۆر.. دەگرێو بەخۆشیەکەوە دەیباتەناو کۆڵیتەکەو لەتەنیشت خۆی دەیبەستێتەوە.
چەردە زیاتر لەناوەوەی خۆی پێدەکەنی کە بەخۆی دەگوت:
- وەڵڵاهی.. هەتاکو ڕۆژ هەڵدێ خەوناچێتە چاویان.. هەر لەدەورووپشتی گیسکە بۆر هەڵدەپەڕن.. گونانی هەڵدەسەنگێنن.. خۆی تێ هەڵدەسوون.. گوێچکە نەرمەکانی لەڕوویان دەخشێنن و.. شەویان لادەبێتەوە ڕۆژی‌ڕەوان.
گیسکەی ڕاست کردەوە.. قولفی پشتبێندەکەی لەملی دا هەندێك شل کردەوە.. هەڵستایە سەرپێ و چۆکێکی لەپاشەڵی‌دا..
ئیسەی لێکرد بۆ ئەوەی وەپێش خۆی بدا
گیسك.. لەو جێگایەی لێی چەقی بوو. نەجوولا، بەتووندی دەنگی‌داو.. تێی‌وە ڕاخوڕیەوە:
- ئیبسە.. هەی خودان مردوو! ئیسە.. دەی.

گیسکه بۆر وەکو هەستی بەو هەموو تێوەغراخوڕینەو بگرەو بەردەیە نەکردبێ، تەنانەت سمێکیشی نەجوولاندەوە.
جەردە. کە دەمێك بوو.. دڵی لەو گیسکە بیژیە پڕببو، خەریك بوو بیداتە بەرپێلەقە، بەڵام لەدواییدا پەشیمان بوەوە!!.
- زۆر ئازاری بدەم گۆشت پەردەدا
وای بەخۆی گوت
وەدووباره نیسەی لێکردەوە.
یەك دوو كۆڵە مستی کێشان بەتیرەقەی پشتی
پاڵێکی پێوەنا، مرازی ئەوەبوو هەر تەنیا لەجێگاکەی بیجوڵێنێ.. پری دایە گوێیەکانی هەڵی گلۆفتن ڕای گوشین لوولی دان.
دای کوتان
کەچی هەمووی بێ سوود بوو. گیسکەبۆر وەکو ئەویش پارچەیێك بێ لەشاخەکە، تاقە مووێکیشی نەجوولایەوە!!.
جەردە.. ئۆقرەی لێ هەڵگیرا.. وەکو چاو.. و ڕاو لەگیسکەبۆر بکا زاری‌نایە بناگوێ‌و بەسەریدا قیژاندی:
- باشە.. باش، بزانە کووچارت بەکەم دەت خەسێنم!.
بۆی نووشتایەوە. ملی نایە بن زگی گیسکەکە.
لەژێرەوە.. دەست و پێی گرتن و کێشای بەزەویەکەدا.
گیسکەکە وەکو گیانی لەبەردا نەبێ.. وەها.. چ بەرهەڵستیەکی نیشان نەدا.
جەردە بەمسەرو بەوسەری پشتبێندەکەی دەست و پێی گیسکی توند توند بەستنەوە. خۆی کوورکردەوە ملی نایە بن زگی گیسکەکە.. هێزی دایە خۆی گیسکی بەرزکردەوە، بەسەر شانی دای هێناو بۆی قیت بوەوە.
بەم ڕەنگە جەردە گیسکەبۆری لەزەویەکە هەڵقەناندو بەرزی کردەوە!!.
بەدەستی‌لەسەر سینگی خۆی لێکی ئالاندن.
بەدۆڵی دەنگارەدا بەرەو کەندەکۆخ.. نشێو بوەوە، بەفرتکێك لەجۆگەلەکە پەڕیەوە، لەبەردەم ئەشکەوتەکەی کەندە کۆخ و دار پەڕوە زەلامەکە ڕابووردو بەبستیەکە هەڵگەڕا دەیەویست بەسەر چاکی خەزولاس دا شۆڕبێتەوە.
لەسەر بستیەکە. ویستێکی کرد
هەناسەیێکی خواردەوە..
چاوی لە گوندە هەژارەکەی بڕین..
گوندەکە نوستبوو..
چ جوولەییکی لەکووچەو کۆڵانەکان بەدی نەکرد، ئەو فانۆسانەی کە بەدەرگای پۆلیسخانەکەو بەنێوچەوانی سەراو.. بەڕۆخ تاکە جادەکەی ئاوەندی گوند.. هەڵواسرابوون.. وەك چاوی برسیەکان سیس دەنایسان.
لەگۆڕەپانەکەی بەردەرکی سەرا، کۆمەڵێك خێو وەك جنۆکە هەڵدەقۆزینەوە.. جەردە خۆی لەو دیمەنانە ڕابورد.. بەسەر چاکی خەزولاس دا.. چوەخوا.. کاتێ گەیشتە ژێر دارە بەرز و پیرۆزەکەی خەزولاس هەندێك سەنگرایەوە بیری لەوە دەکردەوە کە. بەسەر چەند چاك و پیر، بەناو چەند گۆڕستان تێپەڕیوە.. بێ ئەوەی یادیان بکاتەوە.. بێ ئەوەی فاتیحایێك بۆ گیانی پاکیان ڕەوانە بکا.
لەدەروونی خۆیدا.. هەستی بەگوناهبارییێك دەکرد:
- خودا.. حەمەچاوەش و گیسکە بۆر بگرێ.. دەنا کەنگێ لە ئەریت و دەستوری موسڵمانەتی لام داوە؟
ئەمەی لەگەڵ خۆی گوت و لەغەرەکەی پیاو چاکەکە ئاوابوو.. ڕووی لەقیبلە کرد.. دەستی بەفاتیحە خوێندن کرد:
- ئەلحەمدو.. لیلاهی.. ڕەببول.. عالەمین.
لەناو فاتیحە خوێندن دا، هەستی بەگەرماییێك کرد.. لەدەوو بەری ملیەوە.. وورده وورده بۆ ناوشان و لاپەراسوو پشت و سینگ و زك و.. هەتا کلێنژەی بەدرێژایی و پانی.. بڵاودەبوەوە. چاو قوچانێك لەفاتیحە خوێندن وەستا.. بیری ئەوەی بۆ دەهات.. کەگیسکە لەعینەکە بەسەری دامیزتبێ.
بەوبیرکردنەوەیە.. زۆر قەڵس بوو!
جەردە لووتی لێ خستە کار.. بەمشەمش.. سینگ و باخەڵ و لاپەراسووەکانی‌خۆی بۆن کردن. ئەبۆنی میزی کردو ئەهەستیشی بەتەڕاییێك کرد، کەلەوە دڵنیابوو گیسکەبۆر.. بێ نوێژی نەکردووە. بەهێمنی لەگەڵ خۆی‌دا گوتی:
- شەیتان بەلەعنەت بێ.. هەی!.
وەلەسەر فاتیحە خوێندنەکەی بەردەوام بوو:
- ئیهدینال.. سیراتەل.. موستەقیمە..
هەستی بەگرانایێکی زۆری کەلەشی گیسکەکە کرد..
بیری چوەوەو لای گیسکەکەی سەرملی.
لەناوەوەی بزەییێك هەڵستا.
بەخۆی گوت:
- بە وەڵلاهی بیست هۆقەش دەبێ
وەبە خوشیێکەوە بیری کردەوە:
- بەشی قاورمەی زستانمان دەکا.
- بەتێری دەمان گەیەنێتە نەورۆزیش
ویستی لەسەر فاتیحە خوێندنەکەی بڕوا.. بەڵام نەیتوانی بیری لە گیسکەکە جودا بکاتەوە، هەتا دەهات بارەکەی سەرشانی گرانتر دەبوو.. ئەویش هەر بەغیەریزە ملی دەدایە بەرێ‌و تینو تاقەتی بەخۆ دەدا.. پێی دەچەقاندن خۆی لەژێربارەکەدا دەگرت.
کاتێك وای هەست کرد.. کە گرانایی چیایەکەی سەفین.. هەمووی لەو گیسکە بەدفەڕە کۆبۆتەوەو بەسەر شانی ئەویان داداوە!! بەم حاڵە زۆر وەڕس و قەڵس بوو، جارجارە بەناچاری پشتی لەژێر بارەکەدا دەچەماندەوە.
جگە لەگرانایی کەلەشی گیسکەکە.. ئەوەی کە جەردەی وڕو گێژ.. پەشۆکاندوو.. و.. دەهات ورەی پێ بەربدا.. ئەوەبوو کە جووتە گونەکانی گیسکەبۆر.. لەبەر چاو.. و.. هەستی‌دا.. هووردە.. هووردە.. لێك دەکشانەوەو بەل دەبوون و دەبەئمان و.. بەسەر پەراسووەکانی سینگی‌دا.. شۆڕدەبوونەوە!!
سامێك پەڕیە گیانیەوە ئاگای لە فاتیحە خوێندن برا.
بەوڕی لەگەڵ خۆی بیری دەکردەوەو دەدوا:
- پەککوو.. چ گرانە گران!!
- کوڕە بیست هۆقەی چی؟ خۆمن پشتم شکا.
- بەرگە ناگرم.
- ئەوەڵڵا.. بابە.. بەرگە ناگرم!
هەموو هێزی دایەوە خۆی، کەمێك خۆی لەژێر بارەکە کێل کردەوە.. لەخۆی پرسیەوە:
- بەم برسیەتی‌و شەکەتیە، چۆن ئەم بارەم پێ هەڵدەستێ؟.
- ئەوەڵڵا.. بابە.. بەرگە ناگرم.
- هێزم.. لەبەر بڕا!.. خەریکە ئاوی چاوانم دەرژێ!!.
چارقوچانێك.. لەو یەکوو.. دوو.. و.. لێکدانەوەو.. گلەییانەوە.. وەستا.. بۆ ئەوەی هەناسەیێك بخواتەوەو بەخۆی بڵێتەوە:
- بەزووترین کات، خۆم ڕزگار نەکەم.. چاوەکانم دەردەپەڕن!.
- دەبێ.. بەپەلە، ئەم، ماڵخۆ مردە.. بگەیەنمەوە ماڵ.
وەکو بەم قسانەی بارەکەی سووك تر بووبێ، هەستی بەحەسانەوەییێکی ئەفسی‌کرد.. لەبەر خۆیەوە مرتاندی:
- هەرکە گەیشتمەوە ماڵیش.. نوێژی عیشا دەکەم، لەدوای نوێژیش.. هەزار فاتیحە دەخوێنم.
تەکانی دایە خۆی، لەژێر دارە پیرە پیرۆزەکە بجوڵێ، دەیویست پەلە بکاو بەرەوماڵ ببەزێ، هەنگاوی یەکەمی نا هەنگاوی دووەمی بەگرانی دەهاویشت.. کەلە پڕ دەنگێك لەسەر ملیەوە هەڵستا!!.
دەنگەکە بەئاوازەوە.. دەی بێژی:
هە جەردە جەردە جەردە
سەنگی.. گونانم.. چەندە
جەردە.. سەری لەم ئزمە.. سوڕما! پتر سام گرتوو.. بوو!
شتەکەنەدەچووە.. عەقڵی.. نەیدەزانی چۆن لێکی بداتەوە.
شەریا.. بەهاششەیەکەوە.. بەدۆڵەکەدا دەهات و.. گەڵای ووشکی دارە پیرە بەرزەکەی دەڕژاندە سەر گۆڕستانە پیرۆزکەکە.
بڕوایی نەدەد.. بەوشەوە، کەسێك لەوجێگایەدا هەبێ‌و.. گاڵتەی پێ بکا.
هە.. جەردە.. جەردە.. جەردە
سەنگی.. گونانم.. چەندە
ئزمەکە.. دیسان بەرزبوەوە!.. تەونی بیرکردنەوەی ئاڵۆزا.
هەروەها ترسێکی زۆریشی بەسەردا نیشت! تەزوێکی ساردی کارەبایی هەموو لەشی تاساند، بەتایبەت کە هەستی بەوەکرد جووتە گونەکانی‌گیسکەکە هەتا دەهات پتر دەناوسان‌و بەل دەبوون و بۆسەر ئاوکی شۆڕ دەبوونەوە.
ئەم چۆنیەتیە بەیەگجاری پەشۆکاندی.. هەموو سەری لێ شێواندن!
بەبێ ویستی خۆی سەری هەڵبڕی.. ڕووی کردە گوندەکەی.. چاوی لە چنارە گەورەکەی مزگەوت.. چەقین.. پاڕانەوەو ترس لەچاوەکانی دەبارین..
- هۆ.. خدری زیندە، دەهانام وەرە.
هاوارێکی ڕاهێشت.

چاوی لەدار چنارەکەی مزگەوت ئاڵانەوە. دارچنارە. زەلامەکە. لەبەر چاوی‌دا، وەك ئەژدیهاییکی هەزار دەست هەڵچووبوو!! پەنجەدرێژو گرێدارەکانی، لەناوجەرگەی ئاسمان گیر کردبوون.

لەتەوقە سەری دارە ئەفسووناییەکەش. "شێخ مەلا عبدالقدوس" ی موفتی، لەشێوەی "حاجی لەقلەقێك"... هەڵنیشتبوو. بانگ لەدوای بانگی دەدا.

"خەلیفە سەرسۆر" یش، بەهەموو فشوو هورییەکەوە چووبوە پێستی "چرك" ێکی زل!.. سواری دوولکی کەدی، سەرەوەی دارەکە ببوو!.. دوولینگی بارێکی تێکەڵ بەپرچە درێژو خەناوییەکەی ببوون. سەری بەهەموو لایێکی‌دا دەهەژاندەوە.

ئەویش زیکری دەکرد!.. هایوو. هووی لەئەشکەوت و دۆڵەکانی سەفین دەنگی دەدایەوە، لەسەر هەرلقێکی دارە ئەژدیهایەکەش، یەکێك لە دەروێش و سۆفی و حاجی و فەقێ و.. ڕەش و ڕووتی گوندەکەی هەڵنیشتبوون، ئەمانەش لەگەڵ خەلیفە سەرسۆر. بەنزمی ئەو... سەرو ملیان ببوە جۆڵلانە.

ئەوانیش زیکریان دەکرد، هەریەکەشیان شێوەی مەلێکی وەرگرتبوو!! هەندێکیان چوببوونە پێستی "توتی"، هەندێکیان ڕەشۆڵە، هەندێکیان "کرکاك"! هەندێکیان "زەردووشامی"... هەندێکیان قەلەڕەش، هەندێکیان شێوەی "دارکلۆرە"، سۆفیلکە، "پەپووسلێمانکە"، هەندێکیشیان شێوەی "کوندەبەبۆ" و "گێرزوولە" و چۆلەکەیان وەرگرتبوو.

جەردە.. جگە لەموفتی گەورەو خەلیفە سەرسۆر.. گەلێکی لەخەڵکی گوندەکەی خۆی، لەسەر کەدو لق و پۆپی.. دارەکە. ناسینەوە!! بەشێك لەمانە.. هەر هاوسێ و دۆست و خزم و برادەرو دراوسێی خۆی بوون.

- ئەوێیان: دەروێش قادرە
- ئەویشیان.. مەلا کوێرەیە.
- تەیرەکەی.. سەر ئەو لقەی کەبای پایز دەی هەژێنێتەوە.. سۆفی مەولوودە.
- ئەوەی دیشیان.. فەقێ سەلیمە.
- ئەوەی لەسەر لقە درێژەکەی: زمانی وەك ئەژدیها بۆ سەر حەوزەکە داهێشتووە.. عەزیز بەگە.
- لەسەر لقە ووردەکانی بنەوەش.. خدرەلاڵ ومەیسەو وەستا ڕەسووڵو قۆیتاس وبرایم بنجوو و... عەولا گاوانی.. ناسینەوە.

جەردە.. یەواق ووڕماوی، مەشغوولی ناسینەوەی تەیرەکانی سەردارە ئەفسووناوییەکە بوو.. دەمات خۆی بزربکا.. نزمەکەی لەسەر ملی هەڵستایەوە:

هە.. جەردە.. جەردە.. جەردە
سەنگی گونانم.. چەندە

لەگەڵ ئەم نزمەش.. لەپڕ لەسەر دارچنارە ئەژدیها شێوەکەی مزگەوت.. ئاوازەکە دووبارە بەرز بوەوە.

شێخ مەلا عبد القدووس.. لەسەر تۆپکەی دارە ئەفسووناوییەکە.. مل و دەنووکە درێژەکانی بۆ ئاسمان هەڵدەبڕین.. یە لەقلەق.. بەهەر چوار لای خۆی‌دا دەی سووڕاندنەوەو بەدەنگێکی بارێکی پشیلانە بانگی دەکرد:

هە.. جەردە.. جەردە.. جەردە

تەیروتاری سەرکەدولقەکانیش.. سەرو ڕیشیان بەهەموو لایێکیان دا.. دەهەژاندەوەو بەیەك دەنگ.. بەشێوەی "کۆراڵ" ێك لەجەنابی شێخیان وەردەگرتەوە:

سەنگی گونانی چەندە

جەردە.. دەنگی خەلیفە سەرسۆری، لەناو هەموو دەنگەکان ناسیەوە!! دەنگی ئەو.. لەهەموو دەنگەکان گڕترو.. جەهووری بەسۆزو جۆشتر بوو.

شتەکە عاجیباتی بوو، سەری لەجەردە دەشێواندو.. سام گرتوو.. و ووڕوگێژی دەکرد، هەر چەندە لەژێر ئەم هەستە بریندارو..

پڕئازارە دابوو، گرانایی کەلەشی گیسکە بۆڕیش.. نەفەسی تەنگتر کردبوو.. دەماری لەشی کەم کەمەو لەسەرخۆ.. شل دەبوون.. چۆکەکانی تووشی سێ بەڕۆ کردبوون، بەڵام هێشتا دەستی لەگیسکە بۆر نەدەبوەوە.. بەوەڕسی‌و پەشۆکی جووڵایەوە.

بەهەنگاوی گران و لەنگ.. بناروبنار.. بۆی "گردی دێرە" .. لەشی دەگوازتەوەو دەچووە پێش.. دەنگە دەنگی تارماییەکانی بەردەکی سەرا لە مێشکیانی دەدا، بەگرانی و بەبێ ویستی خۆی ئاورێکی بۆلای چەپی دایەوە.

پۆلیس و شەبانەکان.. باڵیان تێك هەڵکێشابوو، بەدوو ڕیز.. لەسەر ملی یەکتری کۆببونەوەو وەستابوون.. قووچکەییکی‌خڕی بڵندیان دروست کردیوو.. مودیر بەگ و قومیسێر.. لەسەری سەرەوەی قوچکە کەوەستابوون، لەسەر یەك لاق.. سەمایان دەکرد..

قەمچییەکانیان وەك فڕۆك دەسووڕاند بۆ هەوا ڕایان دەوەشاندن، ووشە لە قەمچییەکانیان هەڵدەستا، هەردووکیشیان.. دوورقۆڵی و بەدەنگێکی گەورەو مارشی دەیان نەڕاند:

هە.. جەردە.. جەردە.. جەردە

پۆلیس و شەبانەکانیش.. لەژێرەوە.. شان و ملیان هەڵدەتەکاندن‌و.. وەك گای‌گێرە.. بەدەوری خۆیاندا وەردەچەرخان و بەکۆمەڵ و بەنارێکی وەك کۆرسێکی مارش ئاوازەکەیان دەگێڕایەوە:

سەنگی گونانی چەندە
- هۆ خدری زیندە!

جەردە.. هاوارێکی تریش ڕاهێشت، چاوەکانی بەدەوری خۆی‌دا دەگێڕان، وەکو چاوەنواڕی خدری زیندە بکا بکاتە هاواری!
- هۆ خدری.

زۆری لەخۆی کرد، بەکووڕی و گرانی و بەئاستەم دەجووڵایەوە.. کەلەشی خۆی و گیسکەبۆری بەرەو پێش دەگوازتەوە، کە دەرگا فراوانەکەی دێرە دێرینەکەی لێ دەرکەوت.. مام قەشە "ئیستیفان" چوار تاق لەناو کەوانەی دەرگا گەورەکە وەستابوو، هەردوو باڵی بەڕاست و چەپی بڵاوکردبوونەوە. وێنەی "خاچ" ێکی دەنواند.

خەڵکێکی زۆریش لەپشت خانووەکانی گوندەوە هەتا بەر دەرگایەکە.. ڕیز بەڕیز وەستابوون، لە ڕیزی پێشەوە.. شەماشە دنحەو.. شەماشەکانی دیکە بەجلکی "کەهنووتی" و لەدوای ئەمانەشەوە.. ڕەبەنی ژن و پیاو، جوانەکیژ.. پیرەژن.. منداڵ.. هەرزەکار.. پیروپەك کەوتە.. لاو.. شەل و کوێر.. سەقەت.. گردەکەیان داپۆشیبوو.. دەتگووت ڕۆژی حەشرە.

جەردە.. گێلانە لەبەر خۆیەوە پرسی:
- پەککو.. ئەمانە بەوشەوە.. لەکوێ گەیشتنە ئێرە؟

ئارەزووی دەکرد بانگیان بکا.. داوای یارمەتیان لێ بکا.. هاواریان بۆبیا.. بانگی کرد:
- هۆ

پتر لەحەشاماتەکە وورد بوەوە.. لەڕیزەکانی دواوە.. تۆماو سلیوای هاوڕێی ناسینەوە.

بیری کردەوە:
- ئەمانە.. ئیمڕۆ لەگەڵ ئەو.. لەڕێگایەکە کاریان دەکرد!!
- ئەوان.. دەیانزانی، دزۆ لای حەمە چاوەش ئاوخواردنەوەیە..
- وەکو من.. خۆشبارەڕ نە..
- تۆما.. تۆما.. کوڕە.. سلیوا!!

بەهەموو هێزیەوە هاواری کرد، بەڵام وەڵامێکی وەرنەگرتەوە.. بانگەکەی.. دەنگدانەوەو ئەنجامێکی نەبوو، نەیزانی.. داخۆ دەنگی ناگا.. یان خەڵکەکە هەستی پێ ناکەن.

دووبارەو.. سێ بارە.. بانگی کردەوە.. بەڵام هەمووی بێ سوود بوو، مێشك و دەروونی پتر بریندار بوو، زەنگی کڵێساکە.. لەبێ وەستان لێ دەدراو، مام قەشەش هەر بەباڵی بڵاوی.. لەناو زاری دەرگا گەورەکە.. دەجووڵایەوە.. چەند هەنگاوێك هاتە پێشەوە، لەسەر تاتە بەردە زەلامەکەی.. پێش دەرگا.. ڕاوەستا.. سەری بۆلای جەردە ڕایەڵ کرد، ملی دوویست لە لەشیەوە دەرکێشابوو.. جار لەدوای جار.. سەری‌بۆلای کرێکارەکەو حەشاماتەکەی سەر گردەکەش دەهەژاندەوە بارەکەی سەرشانی جەردە.. ئەوەندە گران و بەسەنگ ببووە، قەدی لەگەڵ نوشتابوەوە، گونەکانی گیسکە بۆڕیش هەتا دەهات پتر دەئاوسان و بەل دەبوون و لەسەر ئاوکەوە بۆسەر چۆکەکانی.. شۆڕ دەبوونەوە، گونەکانی گیسکەبۆر.. وەکو دوو کوندە زەلام زەلام.. بەملی جەردە هەڵواسرابوون، لەژێر ئەو بارە.. قورس و ناخۆشە.. بواری ئەوەی بۆ نەمابوەوە.. لەچۆنیەتی خۆی بەولاوە.. بتوانێ بیر لە ڕووداوەکانی دەوری بکاتەوە.

چۆنیەتیەکەی.. پێش دەرگای دێرە کۆنەکەو جەنجاڵیەکەی سەرگردەکە.. تەنیا وەك دیمەنێك لەگلێنەی چاوەکانی چەسپابوون ودووبارە دەبوونەوە، بەوەڕسی و سام گرتووی و شێتانە هەر پەلی دەکوتان.. هەوڵی دەدا.. لەژێر ئەو بارەو لەناو دۆزەخی دەرەوەی.. لەناو هەستی.. ئەو ترسەی لە دەروونیدا چەقیبوو.. ڕزگاری ببێ، دەم نادەم.. خۆی ڕادەتەکاند، لەگەڵ‌هەر خۆهەڵتەکاندنێکیش.. لمووزی لەگونی گیسکەکە دەخشان.

جەردە.. هەناسەی تەنگ ببوو، خەریك بوو چاوەکانی لە کەللەسەری دەرببەڕن، خنکە خنکی گەرووی دەهات.. دەخنکا.. لەژێر باری ئازاری لەش و گیانی مێشکی تەزی بوو.. گێژو هێڕ

ببوو. حەولە حەولی ڕۆحی بو، نگای لە دەوروبەری خۆی پچڕا.

هەموو هێزی دایەوە خۆی، بەهەردو دەستی بەنقەنق، بەنارەقە ڕشتن.. توانی تاکە گونێکی گیسکەکە، لەسەر شانی لابدا.. خەریکی گونەکەی دی بوو.. دەیویست بەرزی بکاتەوەو لەسەر ناوك و کەمەری کەل ببێ، ماندووبوونی لێ دەرژا.

لەگەڵ هێز دانە خۆیو.. لەگەڵ قووەت کردن.. ژانێکی دژوار تیژی ڕووهات.. وەکو دەمارێك لە تیرەقەی پشتی پسابێ.. هەستی بەنازارێکی تیژ کرد، ژانێکی دژوار. وەك برووسکە هەنگافتی، وەخت بوو.. پەراسوو و.. و ناوقەدی لەگەڵدا بتەقن.. و ئەندامەکانی لەشی لێك بترازێن و هەڵوەشێنەوە، لە حەژمەتان دا.. لەژێر زەبری ژان و نازارەکەدا.. بەبێ دەستی خۆی زریکەیەکی لێ هەڵستا:

- هۆ.. خدری زیندە!!

لەگەڵ ئەو هاوارو چریکەیە.. لەخەو ڕاچڵەکی!!

جەردە ئەوها تاساو.. و گێژو وڕببو، بەزەحمەت توانی.. لەناو نوێنەکەی ڕاست ببێتەوە.. هاششەی لێوەدەهات، زرینگەی قوڵفی گوێیەکانی تێکەڵ بەتەپەی هەناسەی سواری دەبوو.. بەبێ ئاگا.. لەبەر خۆیەوە.. هەر دەیگووت و دەیجووتەوە:

- لا.. حەولە.. وەلا.. قووەتە..

شێتانە دەستی بەهەموو لایێکی خۆی دەکوتا.. لێفەکەی لەسەر خۆی تێهەڵدا، دووچاوی لێڵ و زەقی.. دووچاوی خەوتێ شکاوی، بەناو کۆڵیتەکەدا دەگێڕان.

ژوورەکە، ژووری کۆڵیتەکە، لەناو تاریکایی ئەو شەوی پایزە.. نقوم ببو.. جەردە.. دوو.. سێ جار سەری لەقاند، هوشیارییێکی پەیدا کردەوە.. لەپی دەستێکی وەڕووی خۆی داهێنا، بەچەند هەناسەیێکی توند و درێژ.. سیپەلکەکانی دەفین و بوژاندنیەوە، هەستی بەسەرماییێکی زۆر کرد، بەگاگۆڵە.. بۆ نزیك ئاگردانەکە.. خشی، ئاگردانەکە هێشتا ژیلەمۆیێکی تێدامابوو

هەڵستایەوە سەرچۆکان.. دەستی لە ڕۆخ ئاگردانەکە کوتان، دەسکە چیلەیێکی هەڵگرت و نای بەژیلەمۆیەکە.

چەند جارێك ژیلەمۆیەکەی فوودا، ڕووناکیەك لەژووری کۆڵیتەکە گەڕا.. بەچار ژوورەکەی پشکنی، دوومنداڵە فەراژیەکانی ی.. لەڕۆخ "گۆرکەکە" پەلیان لێ هاویشتبوو.. چوە نزیکیانەوە، هەندێ: بەسەریاندا چەمایەوە.. بەجاجمەکە دایپۆشینەوە.. چاوی لەژنەکەی بڕین.

ئایشۆك، هەر بەدانیشتوویی خۆی بەکەندوەکە.. هەڵپەساردبوو، دوو لینگی نیوە ڕووتی بۆلای ئاگردانەکە درێژ کردبون، منداڵە ساوایەکەی.. ئەوها بەسەر جەرگەوە قرساندبوو.. لەگەڵ سینگ و زگگی کردبوویەوە یەك، لایێکی مەمکە سپیەکەی لەگەڵ ڕووی ساوایەکە تێکەڵ ببوو.

چوە نزیکیانەوە.. بەتیژی لەمەمکی ژنەکەی و لەڕووی ساوایەکەی وورد بوەوە.. خوزیێکی قووت دایەوە، ئاهێکی هەڵکێشا.. بەکزی و لەسەرخۆ بانگی کرد:

- ئایشۆك.. ئایشۆك.

- کچێ.. ئایشۆك.

دووبارە بانگی کردەوە.

حەزی دەکرد، ژنەکەشی بەشداری بەسەرهات و کارەساتەکەی بکا، حەزی دەکرد، ئایشۆکیش تێکەڵاوی خەمەکانی ببێ، ئارەزووی بوو.. ژنەکەی هوشیار بکاتەوەو خەونەکەی بۆ بگێڕێتەوە.

ژنەکەی کەوتبووە خەوێکی قووڵ.. ئاگای لەبانگی مێردەکەی ئەبوو، جەردە.. بەخاوی گەڕایەوە لای گۆڕکەکە.. پشت و ناوشانی گەرم کردنەوە، گەرماییێکی فێنکی دەلەش گەڕاو لەخاوی و شلیەکەی کەم کردەوە.

کشایەوە ناو نوێنەکەی، هەستی بەماندووبوونێکی زۆر دەکرد.. گوێیەکانی تەپ ببوون، هێشتا مێشکی وەك گێژەلووکە قرەی لێوەدەهات! هەوڵیدا چاو لێك بنێ و بخەوێتەوە، سەروو ڕووی بەلێفەکە داپۆشین.. ماوەیێك خۆی کرکرد، زیندە خەوێکی نەرم و نیان.. وەکو مژی دوای باران.. دەهات و بەسەریدا دەکشا، هەستی جۆرە حەسانەوەیێکی پێبەخشی، خەریك بوو لەژێر پەڕو باڵی ئەو هەستە نەرمەی خاموش ببێ.. کەدەنگی کوندە بەبوییێك هەست و مێشکی قورنجی:

- تووم.. تووك.. تووك.

لەگەڵ دەنگەکەمڕاچڵەکی.. تەمی زیندە خەوەکەی ڕەویەوەو پەرت بوو! بەناڕەحەتی لێفەکەی لەسەر خۆلادایەوە، هەڵستایەوە سەرپێیان، بە شلۆقی بەرەو دەرگا بەزی.

چووە دەرەوە.. بۆناوباخەکە.. کەمێك بۆی چەمایەوە.. دەستی بە زەویەکەی بەردەمیدا گێڕان! پەللارێکی هەڵگرتەوەو لەژێرەوە هەستی ڕاگرت:

- تووك.. تووك.. تووك.

تووکەی کوندەکە.. وەك هەزاران دەرزی هەست و گیانیان دەهەنجنی.. بۆی کێل بوەوە.. سەری لەدار گوێزەکە هەڵبڕی.. چەند شاقاوێك پاشەوپاش کشایەوە دواوە، کاتێك کە پەللارەکەی بەرەو ژوور دەهاویشت.. بەدەنگ بانگی کرد:

- کششە.. هە.. دوابڕاو!.

گوێی لەشلپەی باڵەکانی تەیرەکە بوو، لەسەر لقێکی دار گوێزەکە.. هەڵدەفڕی.. لەبەر خۆیەوە بانگی کرد:

- دەبڕۆ.. هەی ئاو.. و ئاوچی.

- دەبڕۆ.. هەوارت کەلاوەی کۆشکی زۆرداران بێ.

دونیا کپ بوەوە..

کاك ڕەشید، کە خەڵکەکە هەر بەجەردە.. ناویان دەبرد،

گەڕایەوە دواوە.. دەرگای کۆڵیتەکەی لەدوای خۆی لێك دایەوە، لەسەر گازی پشت.. لەناو نوێنەکەی لێی ڕاکشایەوەو ڕووی بە لێفەکە داپۆشیەوە.

چەند جارێك گەوزی داو تەنیشت گۆڕی کرد، تا بە وەنەوزێکی درێژ درێژ.. هەوای سیپەلکەکانی گۆڕی.

گەی هەموو لەشی لێ شل کردن.. نۆقرەو نارامێك چووە گیانیەوە.. دەهات یەکسابێ.

* * *

کات.. نزیك شەبەق بوو، تەیروتواری پایزە.. دەستیان بەجریوە جریوێکی سارد کردبوو، کەڵەشێرەکە.. لەسەر لیسە بڵندەکەیەوە.. بانگی ڕۆژی دەدا.. جەردە.. هەستی بەخامۆشیێك کردەوە.. حەو.. بەهێمنی، وەك پشیلەیێکی دەستەمۆ.. خۆی تێ هەڵدەسوی هەزڵدەسووی، کە لەدرز و کون و کەلەبەری کۆڵیتەکەش.. لێی خۆش نەهات.. وەکو هەموو بەیانیەکانی ڕابووردووی.. بۆی ڕاست ببێتەوە!!. نرکەیێکی کرد.

خۆی خستەوە سەر گازی پشت.. لینگی بەدرێژایی لێ ڕاکێشان.

لاشەی.. وەك "شەمێ" لەناو گەرمایی و تیتی پێخەفەکەیدا.. نەرم دەبوو.. و.. دەتوایەوە، وورده ووردە پەیوەندی لەگەڵ هۆشی و لەگەڵ دەرەوەی خۆی دەبڕا.. بەئاستەم گوێی لەهەناسەی خۆی دەبوو.. ماوەیێك بەسەر چوو.. نەیزانی.. زۆر بوو.. یان کەم.. کەخەو لەناو شەپۆلەکانی خۆی لوولی دایەوە.

## فەرهەنگۆك

پایدۆز: دەست لەئیش بەردان. "ووشەیەکە ئینگلیزە داگیرکەرەکان لەکاتی خۆیدا بەکاریان هێنا".

نێرەمووك: نەژن و نەمێرد.

پیرمەم: ئەو گردە بڵندەیە کە هاوینە هەواری سەلاحەدینی لەسەر دروست کراوە، وەکو لەناوەکەی دەردەکەوێ، بەناوی یەکێك لەپیرە کۆنەکانی کورد کراوە، هەتا ئەمڕۆش گۆڕی ئەو پیرە پیرۆزە بەسەر ئەو گردەوە ماوەو بوەتە مەزاری خەڵقی ناوچەکە.

ڕەوە: پۆل، تیپ، تەنیا بۆ مەل و گیاندلەبەری خوێن گەرم بەکاردێ.

فەراژێ: مێر منداڵ.

کولیک جوانەمەرگ: گوڵێکی سپی گەشی خۆرسکە، درەنگە پایز بەقۆپەن لەبنار شاخ و گوێی چەم و مێرگ و بەزۆری لەناو باخچەکانی شەقڵاوەو مێرگەکانی بنار سەفین دەڕوێ. لەبەر ئەوەی لەڕۆژانێکی سارد سەر لەزەوی هەڵدەدەن و سەرماو سۆڵە زوو پێی دەگا، تەمەنی کورت دەبێ و هەر بەگەشی و جوانی هەڵدەوەرێ و لەناو دەچێ.

قۆپەن: کۆمەڵە گوڵ یان گیا یان دەوەن.

دەرماناوە: ناوی کانیاوێکە لەسەر ڕێگای نێوان گوندەکانی کۆڕێ و گردەچاڵ کە بەرەو شەقڵاوە دەچێ.

شێرەسوار: دارستانێکی چڕو جوانە، دەکەوێتە نزیک ڕێگای سەلاحەدین و شەقڵاوە، مەزارێکی پیرۆزە و خەڵکی ناوچەکەو شاری هەولێر لەڕۆژانی چوارشەم و هەینی ڕووی تێ دەکەن، کانیاوێکی ساردی لێیەو سەیرانگاییکی ڕەنگینە.

پێخەف: نوێن.

گردەچاڵ: گوندێکە لەسەر ڕێگای سەلاحەدین و شەقڵاوە. شێرەسوار ئاقارێکی ئەو گوندەیە.

بانگی شێوان: بانگی مغرب-، لەناوچەی شەقڵاوەو خۆشناوەتی و لەزۆر شوێنی دیکەش لەهەرێمە شاخاویەکان ئەم زاراوەیە بەکار دەهێنن، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەوای پێ بڵێن چونکە زۆربەی خەڵکی ئەو هەرێمانە خۆراکی سەرەکیان لەوکاتەدا دەخۆن و پێی دەڵێن شێو-

کەندێر: سەرکار. لە ئینگلیزەکان ماوەتەوە.

گۆڕایی خانزاد: لەسە ترۆپکی سەفین گۆڕەپانێك بەم ناوە هەیە بێرێکی لەشاخ هەڵکەندراوی تێدایە، دەڵێن خانزادە خاتوون فەرمانڕەوای میرنشینی سۆران، ئەو جێگایەی کردووە بەهاوینەهەواری تایبەتی خۆی و هاوینان لەهەریرەوە کە پایتەختی خانزاد بووە هاتووەتە ئەو کوێستانە.

کاکێ مێرانێ: بەشێخەکانی گوندی هیران، کە مەرکەزی ناحیەی خۆشناوە دەڵێن- کاکی صافی شاعیری دڵتەڕو ناسك و سۆفی کورد، کاك مستەفای شێخی ئاینی- ڕێگای قادری- گوندی هیران بوو.

شەمچە: شخارتە، لەبادینان و برادۆست پتر بەکاردێ.

کاوانیان: هەریر/ ماوەران/ زراری/ زیبارۆك/ بەحرکە/ ناوی شوێن یان دێهاتن دەکەونە ناوچەکانی شەقڵاوە و هەریرو سەلاحەدین و عەنکاوەی هەولێر.

هۆبە: لەهاتوچۆی گەرمیان و کوێستانیاندا، ڕەوەندەکان هەر کۆمەڵە ماڵێك لە ڕێگایەکی هەڵبژێردراو ڕەشماڵ هەڵدەدەن، بۆ چەند شەوێك دەمێننەوەو دیسان بەرەو کوێستان باردەکەنەوە. ئەم کۆمەڵە ڕەشماڵە پێیان دەڵێن هۆبە، هەر هۆبەش سەرۆك و برا گەورەی خۆی هەیە.

ڕەشەوڵاخ: ئەو ئاژەڵانەی لەڕەچەڵەکی گاو گامێشن.

بەرزە: ئەسپ، ماین، بارگین، ئێسترو ئەوانەی لەم ڕەچەڵەکەن.

وەلسان: مەڕو ماڵات.

سەنگۆ: جوانەگا.

کەڤر: بەردی گەورە، تاشەبەرد.

سەرمەیدان/ بەردی کۆنتێ: دووشوێنن لەبناری سەفین.

نسکۆبردن: ساتە بردن ساتمە بردن.

گردی زەیتوون/ شەقڵاوەن/ گری ئەسحابان: گۆڕستانەکانی نوێ و کۆنی ئیسلامەکانی شەقڵاوەن.

گردی باریان: گردێکی دێرینە لەشەقڵاوەو کەوتۆتە بناری سەفین.

کونە جنۆکە: ئەشکەوتێکی ژێر زەویە بەسەر گردی باویانەوە.

لەپ: پانایی دەست.

دەنگارە: سەرچاوە ئاوێکی جوان و ڕەنگینە لەبناری سەفین هەڵدەقوڵێ دەبێ بە ڕووبارێکی بچکۆڵەو بەناو شەقڵاوەدا دەخزێ و بەرەو باخچەکان شۆڕ دەبێتەوە. سەیرانگایەکی گشتی بوو بەداخەوە شارەوانی شەقڵاوە لەم دواییەدا ئەم ڕووبارە ڕەنگینەی لەناو لوولەی ئاسن دیل کردووەو شوێنەوارو سەیرانگاکەی کوێر کردۆتەوە.

بارتەقا: متقابل.

کامپ: جێ مۆڵگای کرێکار.

جمك: دووانە، تۆم.

بۆرایی: تارمایی

چەلاندن: لەوەڕاندن.

هێورایی: هێمن.

کالەك: کلاش، جۆرە پێڵاوێکی خۆکردیە.

خامەك: قوماشێکە لە ئاوریشم دروست دەکرێ.

قاڕژن: هاور هاواری بزن.

کێرد: چەقۆی گەورە، هی بچووك پێی دەڵێن قەڵەمبڕ.

لاتەرۆك: تەنیشتی لەش.

گیرە: شوێنێکە لەشەقڵاوە.

کەندەکۆخ: ئەشکەوتێکە لەبناری سەفین لەڕۆخ دەنگارە، خەڵکی بۆ چارەکردنی نەخۆشی کۆخە ڕووی تێ دەکەن ماوەیێك لەناویدادە مێننەوە.

خەزوولاس: جێ مەزارێکی کۆنە، وەکو لەناوەکەی دیارە لە "لاس و خەزاڵ"ەوە هاتووە، خەز بچووك کراوەی خەزاڵ ە.

گردی دێرە: ئەو گردەیە کەکڵێسەی دیانەکانی شەقڵاوەی لەسەر دروست کراوە، کڵێسایەکی زۆر کۆنەو مێژووی دروستکردنی دیارنی‌یە.

وەنەوز: باوێشك.

گەلی زەیتان: گەلیێکی قووڵ و درێژە، دار زەیتوونی زۆری لێ چاندراوە، دەکەوێتە بناری سەفین.

کرکاك/ زەردوشامی/ دارکلۆرە/ ئەوانەی/ سۆفیلکە/ شالوور/ ناوی مەلن، بەزۆری لەناو ڕەزەکانی شەقڵاوە و لەدێهاتە چەمیان زۆرە. دەژین.

خاچ: صلیب.

تەم تەم/ زێوەر: دوو گەڕەکن لەشەقڵاوە.

پێلەقە: شاپ، شوللاق.

فرتك: باز،خۆتێهەڵدان.

خێو: تارمایی.

گای گێرە: بەچاو بەسترایی دەخڵ و دانی پێ دەکوتنەوە.

کاگۆڵە: لەسەر دەست و چۆك ڕۆیشتن.

گۆڕك: ئاگردان.

کەندوو: لەقوڕ دروست دەکرێ، ڕسق و تفاقی زستانی لەناودا ئەمبار دەکرێ.

قورنج: قونجرکە، گەزتنی جێگایەکی ئەرمان لەلەش بەدوو پەنجەی دەست.

دووبەدەر: سمین، ئاودیو بوون، دەلاندن.

شەمی: مێوی لەشانە مێشی هەنگ پەیدا دەبێ.

## دوا بەشی ڕۆمانی ڕێگا

شەوێکی کش و مات بوو، کە لەجادە قیرتاوەکەوە بەرەو هەوار دەپەڕیمەوە لە هەموو لایەکدا ماشەشە هێمن هێمنی بێ دوایی لە لق و پۆپی داربەڕووەکان لە دۆڵ و شیوەکان لە چەمە چڕ و درێژەکە هەڵدەستا و دەهات دیدا لە پەردەی هەست و گوێم، ئارامی و هێمنایییەکی دەخستە گیان و دەروونم، هەستێکی بێ گرێ و خۆشی بۆ پەیدا دەکردم بەڵام لەگەڵ ئەو هەست و هێمانایییەش لەناو پێچ و پەنای مێشکمدا جەنجاڵیەکی دژوار وەکو بەرداشێکی زەلامی گڕ دەسوورا و گەڕی دەخوارد مێشکی دەهاڕیم گەرەپێچ و گەردەلوولێکی بەتینی دەخستە ناو جینگڵی بەدەمارە ووردیلەکانی دەدا ڕووبەڕووی دوو چۆنیەتی و دووباری دژ بە یەکتریان دەکردم.

قسەکانی کامەند و عەولای هاوڕێم کارێکی ئەوتۆیان تێ کردبووم کە لەناو دەریای هێمنی ئەو شەوە پایزییەدا دەیان سەدا و زیڕە و زریکەی ناساز و ناڕێک لە مێشکمدا دەنگیان دەدایەوە وەک کوتکی ئاسنگەر ڕەمبەیان لێ هەڵدەستا لوورەی ڕەوە گورگێکی برسی وهاریان دەڕشتە ناوەوەم هەستیان دەڕووشاندم دووچاری لێکدانەوەیێکی تفت و تاڵیان دەکردم، بەو چۆنیەتیەش پتر دڵم دەگوشرا و هەناسەم سوار و تەنگ دەبوو وەکو مەڕی گێژ دەست و پێیان لێک دەناڵاندم بەلادا دەهاتم هەنگاویان بەرەو هەوار پڕ ساتمەو کۆسپ دەکردم، هێمنایی ئەو شەوە کشووماتەیان لێ دەشلەقاندم.

لەدوور لەبنار شاخەکەوە شەو با دەنگی کوندە بەبۆیەکی تێکەڵ بە هاشەشە کە دەکرد، وەک نووکە سووژن لەهەستم دەچەقی مەودای ترس و پەشێوی ناوەوەمیان بەرینتر دەکرد، درزێکی خواروخێچی درێژیان دەخستە تانەی شعورو دیواری سەختی دونیامەندەکە.

مانگ وەکو کولێرەیەکی شامی زەردی قوتاو لەسەر لووتکەی کاروخ ڕاوەستابوو یەکەلی سەیری دونییەکەی دەکرد، کاتێ لەو کولێرەی مانگە ووردەبوومەوە بەخەیاڵ لەگەڵ خۆمدا دەدوام و دەمگوت:

- دونیایەکەی ئێمەش وەکو ئەم کولێرەیە قرتاوە و لەهەزار لاوە کەل و کرۆم بیوە!!

وەبەخۆم دەگوت:

- دونیایەکی ئێمە نانێکی ڕەشی هاردە جۆو هەرزنە وەک ڕۆژی گیراوخۆی دەنوێنێ !

- لەم ڕۆژە ڕەشانەدا کولێرەییێکی قرتاو کەرتە نانێکی ڕەشی تاڵی وەک ڕۆژی گیراو بۆرەشووڕووتی وەکو ئێمە لەو کولێرە زەردە گەنمەشامیەی بە ئاسمانەوە بەسەر لووتکە بەرزەکەوە گیرساوە لەو کولێرە قرتاوە و تەنانەت لە ڕۆژ خۆی دوورەدەست ترە.

لە دواییشدا گاڵتەم بەم خەیاڵانەی خۆم دەهاتەوە، هەتا خۆم بەوە ڕازی دەکرد کە ماندوویی ڕێگا سەخت و دوورەکە برسیەتی و بێ تووکی ڕووداوی چڕو پڕ مەینەت دووچاری ورێنەیان کردووم!!.

- مانگ مانگی حەوت شەوە وەکو کولێرەیێکی گەنمە بەهاری قرتاوخۆی نیشان دەدا کولێرەیێکی زەردی گەنمە بەهاری!

- ڕۆژگێران کولێرەیێکی ڕەشە تاڵەکەی ناو تێرەکی پوور ئەستێم دێنێتەوە یاد، ئەو کولێرە ڕەش و تاڵەی ژەمی بەیانی و نیوەڕۆ و شێومان بوو!!.

- دایکم بۆی دەگێڕامەوە دەیگوت:

- لەگرانییە گەورەکەی دوای شەڕ، زۆر کچی فەراژی لاو خۆیان بەکولێرە جۆیێک دەفرۆشتە عەسکەری تورك و قاوزاقەکانی ڕووس!!

وەدەیگوت:

- لە دەوروبەری ئۆردوگای ڕووسەکان بەدەیان منداڵ وگەنج و پیر و پیرەژن لەگەڵ سەگ و تووله و تاژی شەو و ڕۆژ لەڕۆخ ئۆردوگاکان مۆڵ ببوون، لە برسان و لەبەر نەخۆشی کەوتبوون، قەوزاقەکان بەرماوەی خۆیان بۆ دەهاویشتن!!

هەروەها دایکم دەیگێڕایەوە و دەگوت:

- لەو پەڕاگەندانە ئەوەی هێزێکی لەبەر مابوو و توانای جوولانەوەی هەبوو بەتایبەتی مێرد منداڵەکان لاوەکان ئێرومێ ئەوانە وەگەڵ لەشکرەکە کەوتن لەگەڵ ئەوان کشانەوە، تا ئیمڕۆش هەزاران لەمانە خودا ئەبێ کەس نازانێ چیان بەسەرهات بێ سەروشوێن بوون!

کاتێ ئەو وێنەیەم لەبەرچاو دەژیایەوە ئەو کچۆڵە لاوانەم بەو ڕنگەوە دەهاتنەوە بەرچاوی خەیاڵ بیرم بەنەخشینی خۆشەویستم پەیوەست دەبوو، ترسێکی زۆر وەک مێردەزمە قەلاچۆم دەبوو، تەزوێك وەك برووسکەی بەهار لەگیانم ڕوودەهات بورکانێکی دەخستە دەروونم کەیانی دەهەژاندمەوەو لەسەر لێواری دەریاییێکی لیخنی وەڕەسی خۆم دەدۆزیەوە، بەگرانی خۆم دۆزیەوە، لەو خەیاڵ و بیر ئاڵۆزی و جەنجاڵیە

ڕزگاربم بوو، بیرم بە کامەندەوە گیر سووەوە، عەمەری سلێمان لە خەماڵمدا بۆشییەکانی پڕکردەوە، جێی ئەم

هەموو جەنجاڵییەیان گرتەوە !!

کامەندی دونیادیتەی دەستەپیاوی لەپ زبری ڕووپڕتووندی وعەزم خاوەن هەڵوێست کامەندی خودان هەنگاوی نەلەرزو نەلەقاو، وام بۆدەهات ئەگەر هەموو کارەساتی دونیا لەم پیاوە کۆببنەوە ناتوانن وورەی پێبەربدەن بێیەك دووملیان دەداتەبەر پێشیان پێدەگرێ بەئاسانی ڕێگایان بۆ چۆڵ

ناکا، وێنەی کامەندم لەگەڵ وێنەی عەمەری سلێمانی لێ تێکەڵاودەبوون، لەناوەوە خۆم دەدواندودەمگوت:

ـ ئەم دووپیاوەلەزۆر لایەنەوە یەکتری دەگرنەوە، لەهەمان کاتیشدا لەزۆرترین لایەنیش لەیێك دووردەکەونەوە!!

ـ هەردووکیان تەمەنیان خۆی لەچل سالیدەدا، ئەوهێوارەیە لەژێر دار بەڕووەکان دونیا ئەمەندەڕووناك نەبوو کەمووی سپی سەرو سمێڵی کامەند بەدیبکەم بەڵام لاجانگیعەمەر دان وماشیان تێکەوتبوو چەند

موێکی ئەستووری سپی درێژیش وەك تیشکی ڕووناکی لەناو شەوی سمێڵەکانی سەریان هەڵدابوو، عەمەر

مرۆیەکی سەرگەرم و تووڕەبوو، هەرچەندە سەرگەرمی و تووڕەوتووندیەکەشی لەسەر حەق لێ ئاشکرادەبوو بەڵام زۆرجارسەبارەت بەوکەلله ڕەقیەی توشی گێیرمەو کێشەدەبوو دەکەوتە نێو تۆڕی نامەردان و پیاوەکانی میرو مام حاجی، لەئەنجامیش ئازاری دەچێژت زەرداوێکی زۆری دەرخوارد دەدرا

ـ دووچاری هەڵوێستی وەهایان دەکرد کەبەئاستەم دەیتوانی لێ یان دەرباز ببێ!

ئەمە عەمەر عەمەرم ئەوهادەناسی بەڵام کامەند هەرچەندە لێی ووردەبوومەوە لەجوولانەوەی ئاخاوتنی ڕەفتاری لەگەڵ من وعەولای هاوڕێم هەروەها لەگەڵ ڕووداوەکانی ژیانیشی وەهام بۆ دەهات کە ئەم پیاوە بەهێمنی بیر دەکاتەوە بەهێمنیش لەبابەت ژیان و کارەسات و خۆشی وترشیو تاڵیو

سوێری دەوێت بەهێمنیش شتەکان یەکلادەکاتەوە ئەمجا بڕیاردەدا هەروەهاش لەسەر هەنگاوی زێك و پتەو و نەلەقاو دەنێ!

ڕەنگە بپرسن!

ـ بەڵام چۆن ئەوها زوو کامەندت هەڵسەنگاندوو ئەو جێگا دیار و ڕوونەت بۆ دەست نیشان کرد؟

بۆ ئەم پرسیارەش هەر ئەمەندە دەڵێم کە ئەمە بڕیارێکە و دڵم ئاوی پێ دەخواتەوە قەناعەتم پێی هاتووە بەڵام چۆن وبۆچ؟ ئەم پرسیارەش من لە ئێوەی دەکەمەوە و ئێوەش چۆن وەڵامی دەدەنەوە چۆن خۆتان پێی ڕازی دەکەن ئەوە دەگەڕێتەوە لای خۆتان!!

عەمەر وکامەند هەردووکیان دڵپاك و بە هەموو ئارەزوو و هەوەسیانەوە بەرەو ئامانجەکانیان هەڵمەتیان دەبرد،

هۆی جیاوازی نێوان ئەم دووانەش ئەوە بوو کە عەمەر مرۆییێکی خۆڕسکی پشت ڕەق وەك ئەو دارو دەوەنە بوو کە سروشت لە ئەوێل وزەنێرو شینك و دۆڵ و لووتکەی چیا بڵندەکان ڕوواندویەتی و بەتاویَ باران گەش و ئاسك و تێر بە بەهارێکی ووشك توندو سەخت تر دەبوو بەڵام ئەو جۆرە دارو دەوەنانە هەرگیز لەبەن نایێن وشوێن کوێر نابنەوە و چاوەنۆڕی ئەو ڕۆژو گەڕانە دەکەن کە دووبارە سەرهەڵبدەنەوە و لق و پۆپیان

گەش و بەرەو ڕۆژ قیت ببنەوە.



کامـــەندیش وەکـــو مرۆڤێکـــی خوێنـــدەوارو ڕۆشنبیر ئەوەندەی لە ژیان دەزانیٚ ئەوەندەی تاڵی و تفتی دیبوون بەپیٚی تاقیکردنەوەکانی ژیانــە پڕتەقینـــەوە و ناســـۆرەکەی دەیزانـــی لـــەکوێی دنیایەکـــەمان وەســـتاوە و بـــەڕوون و ڕەوانـــی جیٚ پـــیٚی خۆیدیـاری دەکـرد ئـەوجا هەنگاوی دەنا، ئەو کامەندەم وەکو ئەو داربەڕوو و پیرە گوێز و ڕواڵ و کەوەتانە دەهاتە بەرچاو کە ڕۆژگـــار پـــەنای داون، ڕەگیـــان ئـــەوەندە لـــەناو جەرگـــەی خاکەکـــەیان ڕووچـووە ماوەی ڕوانیـان ئـەوها بـۆ ڕەخسـاوە کەبەهـــەموو ڕەشـــەبایێك ناهەژێن و ڕانەوەشێن

لەگەڵ هـەموو وشکە بەهارێکیش سیس نـەبن و نـەژاکێن، ئـەم کەڵـە دارانـە تەنانـەت لەلووتکـە بەرزەکانیش

نزیك هـەورەکانیش لـەناو بـەفرو تۆف و کرێـوە و زریانیش سەریان هـەر بـەرز دەکەنـەوە و ڕوەوبـان لەڕۆژ دەکەلی

ناهێنن هەر بڵندتر و بەرەو ژوور هەڵدەکشێن.

پێم سەیر بوو چـۆن بـەونیوە شـەرە کشـوماتە لەگەڵ ئەم هەموو ڕووداوە نادیارانەی ناو مێشك و بیرم لـەناو ئـەو دێـو و درنجانـەی ئابلۆقـەیان دابووم چۆن ئەو دوو پیاوە عەمەر و کامەند م بەم ڕەنگە لەبەر چاوی

خەیاڵ قیت بوونەوە؟ ئەوها بەتەوژم و ڕەوانی ڕژانە ناو گیانمەوە!! لەگەڵ هەناسە خواردنەوە و هەناسە دانم تێکەڵ بە وجوودم دەبوون؟

ئەم دوانە بـەم شـەوە درەنگـەکش وماتـە: وەك دوو هـاوڕێی نادیـار ڕێگاکورتـە درێژەکـەیان لەتەکما دەبڕی.

عەمـەر لەوبـەهارەی سـەفەرەکەی هـەولێرم لەگـەڵدا کرد ڕوونـتر خـۆی پـیٚ ناسـاندم، لـەو سـەفەرە کـارێکی وای تێکـردم کـەبۆی نـەکریٚ بەئاسانی خۆمی لیٚ جیابکەمەوە، عەمەر لێم ببو بـە بەشێك لـەو ژان و ژیانـەی لـەناوەوەمدا پێچـــی دەخـــوارد گـەردەلوولی هـەڵدەکرد ببـوو بـە لایەنێکی گرنـگ لـە ئیهتیمامانم بە بەشـێك لـەو هۆیانـەی لـەپێناویاندا دەژیام.

کامـەندیش هـەر بـەو ماوە کورتـە: لەژێر قۆپەنی داربەڕووەکان کە عەولای هـــاوڕێی منداڵیـــم هـــاوڕێی کۆمەڵـەم پـیٚی ناسـاندم، لـەو مـاوە کورتە ئەوەی لە دەروونمدا چەسپاند کە ئەویش لایەنێکی گرنگ لەژیانم پێك دەهێنیٚ و ڕێکی دەخا وە بـەبیٚ ئـەم دووانـە دوور لەعەمـەر و کامـەند ژیـانم وەك مانگەکـەی سـەر لووتکـەی کاروخ کەل و قرتاو دەبوو.

مام زانەوێر دەیگوت:

- خـۆ یـەکدی ناسـین متمانـە بەیـەکتری هۆگـری یـەکتر بوونـی کەسان پەیوەندی بەر سات و کاتـە نییە کە پێکەوە دەژین!!

مـام زانـەوێر لـە پشـوودانەکەی ڕوخ جۆگەلەکـەی باتـاس کـە لەگـەڵ مـام هـەیدەر بەیـــەکتر گەیشـــتنەوە، ڕووبەڕووی خەڵکەکە دەیگوت:

- بەهەمووی دوومانگ لەگـەڵ یـەکتری ژیـاوین بەڵام هی واهەیە. باب باپیریشمان لەگەڵ باب و باپیری یەکدی لەیەك مەنجەڵ لەوەڕاون بەدەیان ساڵ پێکەوە ژیاون کەچی هێشتا ئێمە من و هـەیدەر لـەوان لەیـەکتری نزیـك تریـن و بـاش یەکدی دەناسین!

کامـەنیش چۆنیـەتی کامـەندیش خۆپـی ناساندنەکەی ئەو ئێوارە کزەی ڕۆخ جادەکە لەو کۆبوونـەوە کورتـەی ژێـر چـەتری داربـەڕووە پیرەکـان لەمێشـکی منـدا دەنگدانـەوە و تەمـەنیان لەدەنگدانـەوەی ڕۆژانـی ئـەو دەرودارانـە لەتەمـەنی ئـەو کـەژو کێـو و داربەڕووانـە پـتر بـوو ئیتر چۆن دەتـوانم ئـەم دوانە. ئەم دوو بەشانەم لەخۆم جودا بکەمەوە؟

لـوورە و سـەگوەڕێکی دوور و درێـژ و نەپسـاوە لەگوندە بچکۆلەکەی بنـار شاخەکەی لێواری زار گـەلی بـەرزدەبوەوە و هێمنـی ئـەو دونیایـەی دەشڵەقاند، ئەو لورە و سەگوەڕە پتر هۆشیاریان کردمەوەو هێنامیانەوە هەست کردن بەچۆنیەتیم. سەگ وەڕ هەتا دەهات تەشەنەی دەکرد و پەرەی ئەسـتاند تـاکو گەیشـتە هـەوارەکانی ڕۆخ چەمەکە تووله و تواری هـەوارەکان ئـەوانیش هۆشیار بوونەوە هەستیان بە جوولانەوەی من کـرد بـەگوڕ هاڵاویـان بـۆ هێنـام بـەڵام خاوەنـەکانیان زوو پەخەسـیان و هێدیـان کردنەوە لە پەلاماردان سستیان کردنەوە.

کاتـیٚ گەیشـتمەوە هەوارگـەی خۆمـان دایکـم لەسەر بەرماڵی نوێژەکەی چۆکی دادابوون، لەسەر ڕوو کرنۆشی بردبوو، کە هەستی بەگەڕانەوەی من کرد سەری لەسەر بەرماڵ هەڵبڕی و قیت بووەوە سەرچۆکان دایگرتمە بەر شێلکەی پرسیار:

- کوڕم درەنگ گەڕایەوە بۆ؟

- شێرکۆ داخوا عەولاّ کوو بوو؟

- چی دەگوت؟

- لەکەنگییەوە لێرەیە؟

بۆچـی خەبـەری خـۆی نەگەیاندۆتـەوە گونـد و هۆمەری بارکی؟

- بۆچ چۆن؟

- کەنگی؟

منیـش کـە هێشـتا بەتـەواوی لەجەنجاڵییەکـە ڕزگاریم نەببوو هێشتا بیرم بە کامەند و عەولاّ و ڕووداو بەسەرهاتەکان بەستراببوەوە کە هێـوارە لـەژێر داربـەڕووەکان بۆیـان گێڕامـەوە گێـژاوی هەرایەکەی سلێمانی و یاخی بوونەکەی عەمـەری سـلێمان و هاوڕێیـەکانی لوولیـان دابـووم و لەناوەوە هـەڵیان دەگلۆفتم لەگەڵ دایکم بـەکورتی بڕیمەوە کە لەوەڵامدا پێم گوت:

- دایـە بـەڵیٚ بـەڵیٚ عـەولاّ زۆرباشـە دەستی مـاچ دەکـردی دەیگـوت ئەگـەر شـەو نەبوایـە درەنـگ نەبوایـە دەنـا ئـارەزووی ئـەوەبوو خـۆی بهاوێتـە باوەشـت تامـەزرۆی لێستنەوەی دەستەکانت بوو دایە گیان عەولاّ وەهای دەگوت!!

وەپێم گوت:

- بـەڵام بـۆ پرسـیارەکانی دیکـەت بـەیانی بـەڕێگاوە یەکـە یەکـە بـەدوور و درێـژی باسـت بۆدەکەم وەڵامت دەدەمەوە. دایکم تـا ئەوکاتـە درەنگـــەی شـــەو لـــە چـــاوەنواڕی منـــدا بێدارمـابوەوە ململانـێی لەگـەڵ بـاڵی ڕەشـی ئەسـتووری سـیمورخی شـەو دەکـرد، ئـەوەم لا خۆش هات ئەگەر دایکم هەر تەنها بەڕواڵەتیش بیٚ واخۆی نیشان دەدا کە بە وەڵامە کورتەکـەی من دڵـی ئـاوی خواردبێتـەوە، هـەر بـەو هۆیانەشـەوە هێمن تر بوەوە ماوەیەك بیٚ دەنگ بوو جارجار لـەناو ئـەوبیٚ دەنگیەیـەدا بـەلادا دەهـات دەبـۆرژا بـەگورجی خـۆی کێـل دەکـردەوە چاوی دەکردنـەوە سـەیرێکی منـی دەکـردوو هۆشیاریەکی پـەیدا دەکـردەوە دیسـان پـاش ماوەییێکی کەم دەستی بـەبۆرژان دەکردەوە وا دیاربوو خەو گـەمارۆی دابـوو وەك پۆڕەهـەنگ تـێی وروووژابوو، لـەپڕ سـەری لیٚ بەرزکردمـەوە: بەدەم باوێشکێکی درێژ لەبەر خۆیەوە مرتـەی لێوەهات:

- ئـەوا جێگـام لـەویٚ بۆ ڕاخسـتووی بـڕۆ بخەوە ڕۆڵە بڕۆ پشووە خەوێك بکە بەیانی زوو دەکەوینە ڕیٚ!

- کەدەســـتێکی بـــۆ لای ڕاســـتی خـــۆی جوولانـدەوە، بە دەنگێکـی گـڕی خـەواڵوو پـێی گوتمەوە:

- خـۆت بـاش داپۆشـە ڕۆڵـە گـەلاوێژ هەڵاتووە ئەم دەوچەمە ساردە، مرۆ دەبیٚ ئاگای لەخۆ بیٚ ڕۆڵە !.

- دایکـــم لەســـەر بەرماڵەکـــەی ڕاکشـــا جاجمەکـەی کێشـایە سـەر لاق و زگ و شـان و ملی لێی بیٚ هەست بوو.

من خـەوم زڕابـوو خـەو لێم ببـوو بـەکۆترە کێوێلکەیـەك بـۆم نـەدەگیرا و کـەوی نـەدەکرا، هەرچەندە شەو کردی و من کردم خەو ساتێك بەلای چاوەکـانم گـوزەری نـەکرد زوو زوو گـەوزم دەدا تەنیشت گۆڕیم دەکرد کە لەشم خاو و

شل دەکردەوە چاوم دەنوقاندن بەهەناسەی درێژ درێژ سییەلکەکانم دەدەقین بانگی خەوم دەکرد بەلام هەر هەموو کۆششم لەم ڕووەوە دادێکی نەدا، خەولێم ببوو بە ئاوات لەگەل هەناسە توندەکانم بەرەو ئاسمان بالی دەگرت!

لەسەر گازی پشت لێی ڕاکشام، ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەم لێ دەبوون بەبار، دەبوون بە کۆت وزنجیری زیندانی یەکان وەها لەمل و دەست و پام ئالابوون و کەر تبوومە تورێک و ڕزگار نەدەبووم، چاوەکانم لەناو جەرگەی ئاسمانی شینی قوولی بێ دوایی چەقاندن، ئەستێرەکانی دۆستم ئاسینەوە ئەو ئەستێرانەی لەسەر بانی خانوەکەی قەلاتە پیرەکەی هەولێر لەشەوە دۆزەخینەکەی گوندەکەم هۆگریان ببووم، ئەو ئەستێرە دۆستانە لەگلێنەی چاوەکانمدا دووبارە دەبوونەوە وەك ماسی ڕەنگاوڕەنگی زێڕین زیوین بەفرین لەدەریای چاوەکانم مەلەیان دەکرد شەپۆلیان دەدا ئەوانیش مقوو و هۆگری من بوون، دەیان ڕوام و لەناو قوولایی بێ بنی ئاسمان ئەم سەر و ئەو سەریان پێ دەکردم، ئەستێرە درشتەکانم ئاسینەوە دیسان تێکەلیان بوومەوە:

- ئەها ئەوەپێرووە ئەویدیکەش تەرازووە!

- ئەوەشیان حەوت برالەن شەشیان تەرمی برای حەوتەمیان هەلگرتووە ئەو برا حەوتەمەیان کە لە فرمانێکی پیرۆز گیانی بەخشیوە!

- ئەوەی دیشیان گەلاوێژە کاتێ تەرازووی کەژەکان کەچ دەبێ دەبێتە پێشەنگی پایز زەرد و پڕ دەرد، وادەی خەزان و گەلاڕێزان لەگەل ڕەشوڕووتی ولاتەکەم دەست پێ دەکاتەوە!!

- ئەو شەقامە بەرینە سپی یە ڕووناکەش ڕێگای ئەو پیاوچاك و پێغەمبەرانە بووە کە بەهۆیەوە دەگەیشتن بەخودا و پەیامی ئاسمانی یان لەو ڕێگا فراوانە ڕووناکە بۆ بەندەکان دەڕژاندە سەر زەوی!!

- لەیل و مەجرووم بەهێمنی پاریز بۆ یەکتەر دەبەن وادە و جێژوانی ئەوان و پایزی ڕەنگ زەردوو ئاسمانی بەرینە، بۆیەکتر بزەیان دەکرد و دەدرەوشانەوە

دایکم دەیگوت:

- بەهاران لەیل و مەجرووم لێك جودادەبنەوە، لەیلی چاومەست ڕەگەل کۆچەران دەکەوێ بەرەو کوێستانەکان هەلدەکشن، مەجروومیش مەجروومی شەیدا لە گەرمیان لەو دەشت و بیابان و گەرمەسێرانە دێوانە و وێلە سەودای عیشقی لەیلای خۆی دەبێ!!

داپیرە بنەوشم کە شەوانی زستان داستانی ئەم دوو دلدارە خوداییەی بۆ دەگێڕایەنەوە دەیگوت:

- پایزان لەوکاتەی گەلاوێژ سەرهەلدێنێ زەردی خۆی دەخاتە سەر دار و دەوەنی چیا لەوکاتەی کۆچەرەکان لەگەل قاز و قولینگان لەسەر لووتکە بەرزەکان لە کوێستانەکان کۆچ و کۆچباریان تێك دەنێن نشێو دەبنەوەو دەگەرێنەوە لەیلاش بەرەو گەرمیان دەجوولێ ڕووی گەش دەکاتەوە تامەزرۆی دیدەنی مەجرووم مەجروومیش بەو عیشقە پیرۆزەیەوە

لە ئاسمانەوە چاوەنواڕو خولیای پێشوازی دلدارەکەی دەبێ!.

لەناو ئەو گولزارە بەرینەی ئەستێرەکان دەگەڕام، منیش خولیای دیدەنی خۆشەویستەکانم بووم بەدوای ئاواتە ڕەنگاوڕەنگەکانم ئاسمانی بێ دواییم دەپشکنی ئایشە گوڵ و نەخشینی خۆشەویستم دەدۆزی یەوە وەك دوو گوڵ ئەستێرە لە پێش چاوم دەدرەوشانەوە، ئایشەگولی هەقالی مندالیم لەدوور وەك تارماییێکی ڕووناك لەناو ئەستێرەکان خۆی نیشان دەدام، گولێ هێشتا هەر زارۆکە فەرازیەکەی جاران بوو، دەنگە ئاسکەکەی پەردەی دلی دەلەراندمەوە، وەکو جاری جاران بانگی دەکردمەوە:

- شێرکۆ شێرکۆ وەرە بچینە گەمان با بەگردەکەدا هەلبگەرێین بچینە ناو ڕەزان بچینە زەماوەندی نەورۆز !

وەدەنگە ئاسکەکە ڕەوانتر و ئاسکتر دەبوو کاتێ هەلی دەکردە گۆرانی و ئاوازە شیرینەکانی وەك بای شەمال لە تەل هەستی دەدام و دەڕژایە ئاوەندی گیانمەوە:

هەی ئاغا و ئاغاو ئاغە
بۆم تێکە جەرگم داغە
مانگ لە ئاسمان ڕاوەستاوە
ئەستێران دەوریان لێ داوە
یاری خۆمەو لێم تۆراوە

ئایشەگوڵ وەکو ڕۆژانی مندالی لاسایی دایکی جەمالی دەکردەوە بە ڕووم دەگەشایەوە، لەگەل جریوەی ئەستێرەکان ڕووی پتر دەپشکووت و دەدرەوشایەوە کەم کەمە بالای بلندتر دەبوو دەست و پلی سپی و ڕووی خڕتر دەبوو، لەبەر چاومدا دەبووەوە کیژە شۆخ و شەنگەکە میوە پێگەیشتووەکەی گەڕەکی تەیراوە، ئەو شەوە ئایشەگولیش لەناو مێرگی ئەستێرەکان گەش ببووەوە، کۆرپەیێکی وەك ڕۆژێکی بچکۆلە بە باوەشیەوە گرتبوو ڕۆژە بچکۆلەکەی بەتین بۆن دەگرد توندتر بەسینگیەوە دەی قرساند پەڕەی گولە سوورەکەی ڕوومەتی هەلدەمژی دەم و لێوی دەلیستنەوە، لەگەل خۆمدا ڕۆژە ڕابوردووەکانی ئەو کیژۆلە هاوڕێیەم بەسەر دەکردنەوە و دەمپرسی:

- دەبێ ئایشە گوڵ لەگەل عەزۆی برای بە چ گەیشتبێ؟

- دەبێ ئەم دوو بێدین و ئابڕوانە چ پەندێکیان بەو کیژە پاکە خۆشەویستەم کردبێ؟

ئاهێکی توندم هەلدەکێشا چاوم لە ئایشە گوڵ دەئالان ڕووناکی چاوەکانم تێکەل بە ڕووناکی چاوی ئەو دەبوو، کۆرپەکەی سەر سینگی بە ڕوومدا دەتریقایەوە چەچە سپی یە بچکۆلەکانی لە مەمکی دایکی گیر دەکردن دەمی بەو کاتی ژیانەوە دەنا، ئایشەگولیش بۆم دەگەشایەوەو کامەرانی دایدەپۆشی دەستی بۆ دەورووبەری خۆی دەوروبەری خۆی بۆناو مێرگی ئەستێرەکانی ڕایەل دەکرد چەپکێك ئەستێرەی زێڕینی بریقەداری لەناو گۆلمی دەستی کۆدەکردنەوە لەو بەرزاییەوە بەسەر مندا دەیباراندن و بلاوی دەکردنەوە ئەو

ئەستێرانە پتر ڕۆناکیان دەدایە ئەو شەوە کشومات و هێمنە !

- دەبێ کۆرپەکەی ئایشەگولێش دروشم و ماکی ستەم و زۆرداریەکەی شێخ قگب الدین و نووکی خەنجەرەکەی عەزۆی خالی بەسەر لەشە ئاسکەکەیەوە مۆر نەبێ؟ وەك ئەو دروشم و ماکانەی لە نووکی ڕم و سوونگی ڕۆژگار و میر و میری و زۆردارەکان بەلەشی نیمە خەلکی گوندە جوانەکەمان جێ شوێنی دیارە؟

ئایشەگوڵ لەناو ڕووی کۆرپەکەی لەسەرەخۆ هەلدەکشا بۆ ناوجەرگەی ئاسمانی قوولی بێ دوایی هەلدەکشاو کزدەبوو دەتوایەوە، لەجێگای ئەویش ڕووی خڕو زەردنەسمەری نەخشینی دەلال دروشمیان لەمێشکمدا ئاشکرا دەبوو لەدەروونم دا ڕەنگی دەدایەوە لەناو گلێنەی لەیل نەخشینم دەدۆزیەوە بەهەر پێنج پەنجە جریوەی دەکرد بانگی دەکردم.

بە دەنگێکی نەرمی پڕ سۆز و خۆشەویستی بانگی دەکردم:

- شێرکۆ وەرە وەرە!

ئاهێکی گەرمم هەلدەکێشا تامەزرۆی ڕووی نەخشین بووم، چۆن مەجرووم تامەزرۆی گەیشتنە بە لەیل منیش وەکو مەجرووم تامەزرۆی نەخشینم، ئارەزووم دەکرد هەلکشێم بفڕم بفڕم تاکو دەگومە ناو ئەستێرەکان لەناو ئەستێرەکان بیگرمە باوەش لەگەل ئەودا تێکەل بە کاروانی ئەستێرەکان ببم لە ڕێگا ڕووناکە فراوانەکەی ئاسمان بتاوێمەوە ببمە بەشێك لەو ڕێگایەی خودا و خەلکی ڕەشوڕووتی ولاتەکەم بەیەکتری دەبەستێتەوە.

لەناو چاوی ئەستێرەی لەیل چاوەکانی نەخشین بەکزی پڕشنگیان دەدا و بانگیان دەکردم:

- وەرە وەرە !

لەبەر چاوی خەیالم لەیل و نەخشین یەکتریان دەگرتەوە تێکەلاوی یەکتری دەبوون دەبوون بەیەك باوەشیان بۆ دەکردمەوە!

- ئای چەند وێل و سەرگەردانی گەیشتنم بە نەخشین هەروەکو سەودا و سەرگەردانی مەجرووەمی وێل بۆ گەیشتن بەلەیلایەکەی!!

- بەهاران لەیل و مەجرووم لەیێك جودا دەبنەوە، لەیل دەگەل کۆچەران دەگەل قازو قولینگان هۆبە بەهۆیە بەرەو کوێستان هەلدەکشێ!

دایکم وەهای دەگوت !

ڕۆژێك لێم پرسی یەوە:

- دایەگیان بۆچ کە گەلاوێژ سەرهەلدێنێ قازو قولێنگ لە کوێستانان ڕۆخ بێرمە بەرزە ساف و ساردەکان بەجێ دێلن و بەرەو گەرمیان دەگەرێنەوە لەیل و مەجروومیش بەیێك دەگەنەوە؟

وەپێم گوت:

- داپیرە بنەوش کە هەقایەتی ئەو دوو عاشقەمان بۆ دەکا وەها دەلێ!

دایکم پرسیارەکەی لەبیر دەبردمەوە کە دەیگوت:

- لەوکاتەی لەیل و مەجرووم بەیێك دەگەنەوە هەموو دونیا پڕ دەبێ لەڕووناکی تاریکی شەو وەك دێو و درنج وەك هەورەکان پەرت دەبێ، مانگ و ئەستێرەکان لەبەر ڕێزی ئەو

بەیێك گەیشتنەیان خۆیان بەدەر ناخەن لە ناو شەوقی ڕووناکی دەتوێنەوە، دار و دەوەن گیاو گوڵ سەر دادەنەوێنن و زەوی ماچ دەکەن خۆیان لەبیر دەکەن، هەموو زیندەوەر و گیانلەبەرەکان دەکەونە جووڵە و بەئازادی و بێ ترس وەسەر زەوی دەکەون، کۆت و زنجیری دیلەکان کەلەپچەی زەندی گرتووەکان شەق و شلۆق دەبن، دەرگای زیندان و گرتووخانە و بێرکم و تەوێلە و قەفەزەکان لە ڕێسمە دەچن و ئاوەڵا دەبن.

دایکم خۆی بۆ ئەولاو ئەم لای دەهەژاندەوە و بەجۆرە ئاوازێك وەکو لاواندنەوە بەدەنگێکی نەرم دەیگوت:

- هەژارەکان هەژارەکانی خودا ئەوانی لە ڕوحمی خودا دەگەڕێن ئەوانەی برسی پاروە نانێکی ئاسمانن لەو شەوانەی کە چاوەڕێی بەیەك گەیشتنی لەیل و مەجروومیان تێدا دەکرێ بە بێداری و شەونخوونی دادەنیشن هەتا لەو ڕووداوە پیرۆزە ئاگادار و بەشدارین. چونکی ئەو کەسەی ئەو شەوە بەچاوی خۆی ببینێ هەر مراز و ئاواتێکی هەبێ هەر خواست و پێویستیەکی هەر ئاتەواویەکی لە ژیانیدا هەستی پێ بکا هەمووی بۆ دێنە دی و دەسگیر دەبن خودا جێبەجێیان دەکا!!

- دیلەکان ئازاد دەبن!

- دەرگای زیندان و بەندیخانەکان دەکرێنەوە

- زنجیر و کۆتی زیندانیەکان هەڵدەوەشێنەوەو دەشکێن

- قەفەزەکان شیرازەیان شل دەبێ و دەرگاکانیان ئاوەڵا دەکرێنەوە!

- شالوور و مەل و باڵندەکان دەنگیان دەکرێتەوە دەست دەکەنەوە بە ئاوازی ژیان!

لەدواییدا دایکم بەدڵساردی و بەدەم ئاهێکی درێژەوە دەیگوت:

- بەڵام بەفرمانی ئاسمان هەموو ئەو کەسانەی هەموو ئەو هەژارانەی لەو شەوەدا بێدارن کاتێك وەڕەس دەبن خاو دەبنەوە سەریان وەچۆکیان دەکەن خەو گەمارۆیان دەدا.. تا لوولیان دەدا و ڕەپێچی عالەمی خۆیان دەکاتەوە، سەردەمێك بەئاگا دێن ڕووداوە پیرۆزەکە ڕووی داوە وتەواو بووە، لەیل و مجرووم لە یێك دەکەڵ هاتوون.

خەڵکەکە هەژارەکان ئەوانەی ئەو شەوە بێدار بوون پتر سەریان بە ئەژنۆیانەوە دەقرسێنن دەکشێنەوە ناو عالەمەکەیان عالەمی وەڕەسی و بێ دەسەلاتی و خەو و خەیالات، هەروەها زیندەوار و شالوور و تەیر و گیانلەبەرە دیل و بەندکراوەکانیش دەرگای زیندان و قەفەزەکانیان لێك دەدرێتەوەو ئیتر مل دەدەنەوە ململانێ و هەوڵ دەدەن بۆ شکاندنی ئەو دەرگاو چەپەر و تانوکانە هیوای ڕزگار بوون ساردیان ناکاتەوە هەتا بۆ یەکجاری سارد دەبنەوە.

- لەسەردەمی منداڵیم دا لەگەڵ منداڵەکانی گەڕەك.. لە دەوری پوور بنەوش کۆدەبووینەوە، قنیاتمان لەخۆ دەبڕی، پووریێ باسی ئەو شەوە زەنگەی بۆ دەگێڕاینەوە و دەیگوت:

- لەزەمانی بەری لەو شەوەی لەیل و مەجرووم تێیدا بەیەك دەگەنەوە پیرەژنێك لەدەنگی باعەی گوێرەکەکەی و قیژەی مریشك و تەیر و تیوار لەخەوی شیرین ڕادەپەڕێ، سەیر دەکا ئەو شەوە تاریکە بووەتە ڕۆژی ڕووناك، دونیا پڕبووە لە نوور، گوێرەکەکەی لەسندم و پەتك ئازاد بووە بە فرتك و هەڵبەز هەڵبەز لەناو مێرگی باخچەکەدا هەڵدەپەڕێ و بەدەورەی مانگای دایکی سوور دەدا، مریشکەکان کردوویانەتە باڵەفڕە و لەناو پەرژینەکە دەرچوون لەدەورەی کەڵەشێرەکە سەما دەکەن باڵ لێك دەدەن بە ئاوازی خۆش دەقوقێنن، کەڵەشێرەکەش وەکو سەر لەشکر بەفش و فۆڕی لەسەر بەردە دەستارەکە وەستاوە بانگ لەدوای بانگ دەدا، پیرەژن وەها لێکدەداتەوە کە بەرەبەیانە، کشە لە کەڵەشێر و لە مریشکەکان دەکا، پەلاماری گوێرەکەکەی دەدا و لە نزیکترین لقەدارێك دەیبەستێتەوە و دەکشێتەو ناو نوێنەکەی و دیسان خەو دەیباتەوە.

کاتێ ڕۆژی ڕاستەقینەش هەڵدێ پیرەژن لەخەو بەئاگا دێ دەبینێ گوێرەکەکەی وەك کۆتر لەسەر تەوقەسەری دارتووە پیرە زەلامەکە هەڵ نیشتووە خەڵکی گوند لە پیرێژن کۆدەبنەوە، مەلای مزگەوت هەزار و یەك فتوای ئاڕەوا دەدا و هەزار و یەك کەم کوڕی دەداتە پاڵ پیرەژنی سادەی بێ تاوان!!

مەلا بانگ دەکا:

- ئەو پیرێژنە سەر ئاسنە سیحربازە جادووگەرە!

وە بانگ دەکاتەوە:

- بەقورعانی قەدیم لەو ڕۆژەی هاتمە گوند و پیرەژن تازە پێ دەگەیشت من دەمزانی سیحربازە و جادووگەرە، چاوەکانی بەژن و باڵای سیحریان لێ دەباری!!

خەڵکەکە بیری ئەوە دەکەنەوە کە ڕابکەن و لەپیرەژن دووربکەونەوە، گوێرەکەکەش لەسەر پۆپی دارە بڵندەکە یەك بانگ و دووبانگ و سێ بانگ دەکا:

- باع ع ع !

خەڵکەکە هەوڵ دەدەن لەو مەیدانە دووربکەونەوە بەڵام لەولاوە لەدوور. لەناو ئەشکەوت و دۆڵەکانی چیایەکەی پشت گوند دەنگێك دەنگێکی زوڵاڵ و زەلام بەرز دەبێتەوە و بانگی خەڵکەکە دەکا:

- شەو شەوی لەیل و مەجرووم بوو!!.

خەڵکەکە هێدی دەبنەوەو بەرکەوە سەیری مەلا دەکەن. مەلا خۆی لە چۆنیەتی خەڵکەکە گێل دەکا، پیرەژنیش بە پەشیمانی دەست لەیێك دەدا و گلەیی لەبەختی ڕەشی خۆی دەکا کە چۆن لەو کاتە ئاوات و مرازی خۆی نەخواست و داوای ئیمان و بەهەشتی نەکرد؟.

ئەوجا مەلا پتر لە پیرەژن هاتە پێش و کەوتە سەرزەنشت کردنی، ڕووبەڕووی خەڵکەکە بەزۆری و ئۆقرە لێ هەڵگیرانێکەوە دەیگوت:

- بەڵام تۆ هەر لە هەرەتی لەگەڵ من ڕێك نەدەکەوتی!

پیرەژنیش دەمی بەسترابوو زمانی نەدەگەڕا. ڕۆڵەکانم ئەگەر ئەمن لەجیاتی پیرەژنەکە دەبووم دەزانن چیم لەخودا و لەیل و مەجرووم بە ئاوات دەخواست؟

ئێمە منداڵەکانیش بەیەك دەنگ بانگمان دەکرد:

- چی چی پووریێ گیان چیت دەخواست؟

پوورینەوش لەسەر خۆ دەیگوت:

- لەسەرەوەی هەموو داوایێك داوای ئیمانم دەکرد بەڵام لەناو دڵی خۆمدا پێش هەموو شتێك داوام دەکرد ببمەوە کیژە چواردە ساڵەکەی کوێستان لەگەڵ کوڕ و کاڵ و کیژوکاری گوند دەچوومە بێرێ، هەروەها داوای تەمەنێکی درێژیشم دەکرد تەمەنێکی وەها کە بەهۆیەوە بمتوانیبا ئەوەندە چاکە و خێر و حەسانات بکەم کە خودا بەبێ پاڕانەوە و واسیتەی لەیل و مەجرووم و مەلاو شێخ و میر ڕێگای بەهەشتی دابام بەشکەم کۆشکێکی زێڕینیشی لەوێ پێ دەبەخشیم!

پوورێم.. بەحەسرەتەوە دەستی لێك دەدا و دەیگوت:

- ئاخ بۆ شەوێکی وەها ئاخ!

لەپاشانیش پێی دەگوتین:

- ڕۆڵەکانم مەسەلەیێکی کوردی هەیە دەڵێ ئەوەی بۆ گورگەری هەڵدەکەوێ بۆ ڕاوکەری هەڵناکەوێ.

ئینجا ئاهێکی توندی هەڵدەکێشایەوە.

منیش لەوکاتەدا لەدەم چۆمی خەلیفان لەهەوارگەی کاروانی ڕەش و ڕووتەکان بەهەناسەیێکی توند سیپەلکەکانم دەبووژاندەوە، هەوڵم دەدا پشوە خەوێك بکەم بەڵام خەو لەپەنا ئەستێرەکان خۆی لێ شاردبوومەوە سەیری ئاسمانم دەکردەوە، تیشکی ئەستێرە گەشەکە لەناوەندی چاوم دەڕواو چرۆی دەکرد، لەگەڵ خۆمدا دەمگوتەوە و دەمپرسی:

- کێ دەزانێ بەشکەم ئەمشەو ئەو شەوەیە کە لەیل و مەجرووم تێیدا بەیەك دەگەن؟

دیسان لەناوەوە لەخۆم دەپرسی:

- بەڵام ئەگەر لەپڕ ئەو کاتە داهات کە لەیل و مەجرووم بەیەك بگەنەوە ئایا من چ ئاواتێك بخوازم؟

- ئەخشێن ئاواتێکی گەورەی دڵ و دەروونمە!

- یان ئەو ئاوات و ڕاز و نیازە زۆر و زەوەندانەی کە لەناو مێشکمدا دەخولێنەوەو ئایەنە ژماردن؟

- یان ئەو کۆمەڵە ویست و نزا و دوعایانەی دایکم هەموو شەوێك لەکاتی نوستندا هەموو بەرەبەیانێك لەگەڵ زەردەپەڕی ڕۆژهەڵات لەسەر بەرماڵی نوێژەکەی لەگەڵ هەموو پاروە نانێکی تاڵ و ووشك دەینێتە ناو دەمی، لەگەڵ ڕۆژاوا ئەو ویست و داخوازیانەی ئەو بۆ خەڵکە ڕەشوڕووتەکەی گوند و ئومەتی موحەممەد دەیان خوازێ؟

- یان ئاواتی ڕەنگاوڕەنگ بۆ کۆرپەکەی ئایشەگوڵ! ئەو کۆرپەیەی زەدەی ستەم و زۆرداری و برسیەتی و درندەیی زۆردارەکانی وەکو شێخ قگب الدین و تۆفیق بەگ و مودیر و حاجی و دەست بڕەکانی میر بوو؟

- کام ئاوات بخوازم؟

- لەیل و مەجرووم چۆن دەتوانن ئەم هەموو مرازانەی من و دایکی کلۆڵم و هەموو ویستانەی



خەڵکە ڕەش و ڕووتەکە بهێننە دی و جێبەجێیان بکەن؟
لەناو ئەو دەریایە بەرین و شێلوەی ئاوات و خواستانە لەدوور لەیەکێ لە هۆبەکان دەنگێکی ناسک پەردەی گوێی دڵمی لەراندەوە، دەنگی ساواییێك بوو دەنگی کۆرپەیێك لەوەڕسی ئەو شەوە سەختە هاواری دەکرد، دایکەش لایلایەی بۆ دەکرد هەوڵی دەدا ژێری بکاتەوە لایلایەی بۆ دەکرد و دەی لاواندەوە:

لای‌لایە ڕۆڵە لایە کۆرپەم لای‌لایە
خوا بتپارێزێ لەخەم و بەڵای پیرە دونیایە

لەگەڵ بانگی ساواو دایکەکە دیسان هەستم بە وجودی خۆم کردەوە، لەخۆم دەپرسی:
دایك و کۆرپەش ملی ئەم کاروانی گەنمەیان گرتۆتەبەر؟
لەهەژمەتان لەناو نوێنەکەم ڕاپەڕیم، چاوەکانم هەڵگڵۆفتن، دەنگی سەگوەڕێکی پچڕپچڕ لەبنار شاخەکەوە هەڵدەستایەوە
باڵندەکان چۆلەکەو قەل و کۆتر لەناو هێلانەکانیان لەسەر لق و کەلی دارەکانی چەمە چڕەکە دەستیان بە خوێندن و جریەوەجریو کردبوو، باڵندە بچووکەکان کەوتبوونە هەوڵە هەوڵ و باڵەفڕکێ، لەسەر لووتکەی دوو دیواری بەرزی شاخەکانی زارگەلی عەلێ‌بەگ قاسپەی دووکەو بەرزدەبوەوە لەو بەرەبەیانە دەنگی دەدایەوە ڕکەیان بۆ یەکتری دەکرد و بەگەف و چاوڕاو بەرامبەر یەکتری وەستابوون یەکتریان تووڕە و سڵ دەکرد زریکەیان ئەو ناوەی پڕ کردبوو.
مانگ لەناوەندی ئاسمان هەتا دەهات ڕەنگە زەردەکەی سپی دەبوو و کاڵتر دەبووەوە، ئەستێرەکان لە جریوە کەوتبوون پرشنگیان لە چاو بڕابوو، ئاسۆی ڕۆژهەڵات لەسەر بەرزایی و کەپکەکان بە درێژایی هەتا چاو بڕدەکا خەتێکی سپی کێشابوو تاریکی شەوێکی دوور و درێژ و پڕ مەینەتی بڵاو دەکرد لە جێگای تاریکایی‌یەکە چەتری سپی لێ هەڵدەدا وەك ڕەوە کۆترێکی سپی زۆر و زەبەندی بێ دوایی لەسەر لووتکەکان بەدرێژایی ئاسۆ لێی هەڵدەنیشت، شنەبایێکی ساردی ئادیار بەسەر هەوارەکان تێ دەپەڕی دار و دەوەنی لەخەو ڕادەکردوو پەردەی بۆری شەوی لەسەر ڕووی سەوزی چەمەکە و دارستانەکان هەڵ دەکردەوە و لای دەدا سەرکەلی دارە بەرزەکانی دەلەراندنەوە خەڵکی هۆبەکانی دەخستە جووڵانەوە، خەڵکەکە لە وەستانی شەوێکی درێژ و گران وەڕەس بوون ئاواتیان ئەوەبوو زوو دوایی بەو کاروانە کزەیان بێنن لەناو دەروونیان بانگیان دەکرد:
- بەسیەتی ئەی شەو باڵی ڕەشت لەسەرمان لادە، بەسیەتی تاریکی و وەستان بەسیەتی برسیەتی و نووستن!!
- چاوم لە ئاسۆی ڕۆژهەڵات پڕببوون کە دەنگی مەلاحەمید پاڵە پەستۆی کونی گوێچکەم بوو:
- ئەڵڵاهو ئەکبەر!
لەچەند شوێنێکی دیکەش لەناو هۆبەکان مەلا و پیاوەکانی خودا بانگی خودایان دەکردەوە، خەڵکەکە لەسەر نەریت و ڕەوشتی باب و باپیرانیان بەپێی ئەو بڕوایی قایمەیان کەوا:
- لەخودا بەولاوە کەسێك ناتوانێ بێتە هاواریان یان لە ئازار و دەردەکانیان کەم بکاتەوە!
هەموو خەڵکەکە لەسەر چۆکان کڕنۆشیان بردوو ڕوەو ڕۆژئاوا بەرەو بەزاییەکەی ئاسمان دەستیان پان کردەوە. دایکم لچکی بەرماڵەکەی لێك کردنەوە ئەویش ڕووی کردە قیبلە و ماوەیێکی زۆر لەگەڵ خودای خۆی مەشغووڵ بوو، کاتێ نوێژو نزاکانیشی تەواو کردن ڕووی دەمن کردوو لەسەرەخۆ گوتی:
- کوڕم دەی با خۆمان کۆبکەینەوە!
وە بە گرانی لەسەر بەرماڵەکەی کۆم بوەوە و بەلەنگی هەڵستایە سەرپێ و بەدەنگی بانگی ڕاهێشت:
- بەتەمای تۆ هەر بەتەمای تۆ یاڕەببەل عالەمین!
جموجۆڵ لە ڕۆخ چەمەکە و لەژێر داربەڕووە پیرەکان لە هەموو هەوار و هۆبەکان وەك شڵغە مەنگ دەستی پێ کردەوە، خەڵکی کاروانەکەی ئێمەش پاش ئەوەی لەدوای مەلاحەمید جەماعەتیان بەست و فەرزی خودایان داوە و لە نزای نووکەنووك و پاڕانەوە بوونەوە بەکۆمەڵ کەوتنە مشووری خۆ کۆکردنەوە. هەرکەسە پڕپێچکەی خۆی تێکدەنان تێڕ و خورجەکانیان داگرتنەوە خاوەن گوێ درێژ و یێك سەمەکان دەسکە پووشێکی دیکەیان هاویشتە جێ ئاخوڕی وڵاخەکانیان، پوور زولێخا و پوور ئەستی و دایکیشم چارۆگەکانیان لەسەر و ملیان قایم کرد، بەدەم فاتیحە خوێندن و نزاکردن؛ بارگەکانیان تێك دەنان، مەلا حەمید بەرماڵەکەی لوول داو قەدی کرد و بەئەسپایی هاویشتی‌یە سەرملی، مام زانەوێر و مام هەیدەر و عەلەئێختە و کەسانی دیکەی کاروانیش خۆیان گورج دەکردو کە شەبەقیش ئاشکرا بوو ڕۆژی



تازە تیشکە زێڕینەکانی لەسەر لووتکە بەرزەکان دەچەقاندن مێش هەنگ و زیندەوار و باڵندە کەوتنەوە کارو پەیداکردنی بژێوییان کاروانەکانیش ڕیزیان بەستبوو لەسەرەخۆ دەجووڵانەوە، خۆیان دەهاویشتە ناو زارکی فراوانی گەلییە درێژەکە.
کە دەنگی هەراو هۆریای کاروانییەکان بانگە بانگی پیرەژن و پیرەمێردەکان گریەو پێکەنینی ساوا و منداڵەکان تێکەڵ بە تەقە و ڕەقەی پێ خوستی سمی وڵاخەکان دەبوو ئاوازێکی تێکەڵاو و گڕو سەوداییکی کزی بە خەڵکەکە دەبەخشی، هەروا ئاوازێکی تازەی لەناو دەروون دا دەپشکواندن و لەگەڵ هەنگاوڕنان چرۆیان هەڵدەدا.
ئەو بەیانییە مام زانەوێر لەتەک مەلا حەمیددا ببوونە سەرقافلە و پێشڕەوی کاروانەکەی ئێمە، مەلاحەمید سواری کەرەکەی ببوو، بەپێی مام زانەوێری پیادە لێی دەخوڕی.
ئاوڕێکم بۆ دواوەی خۆم دایەوە بۆ هەوارگەی شەوی ڕابووردوو جێ هەوارەکان پتر وەشارێکی وێران کراو دەچوو، سەودای شەوی ڕابووردوو ئەو کابووسانەی لوولیان دابووم و هەناسەیان پێ تەنگ کردبووم هێشتا لەدەروون و مێشکمدا ڕەنگ و دەنگیان دەدایەوە.. مێشکیان کاس کردبووم، لەناوەوەم لەگەڵ خۆمدا دەمگوت:
- کاروانەکەی ئیمڕۆمان جیاوازی لەگەڵ کاروانی دوێنێماندا هەیە، کاروانەکەی ئەم بەیانییە لەکاروانی ئەو مشەختانە دەکا کە لەدوای کارەساتی گەورە پەڕاگەندە و وێڵ و سەرگەردان و دەربەدەر دەن!.
- کاروانەکەی دوێنێ دەبوو، کاروانەکەی ئێمە و کاروانەکەی مام زانەوێر و کاروانەکەی دۆڵی ئالانە کە لەلای بیتوێنەوە هاتبوون جگە لە سەدان پەڕاگەندە و گەڕیدە دەربەدەر کە لە چوارقوڕنەی وڵاتەوە هاتبوون و لەدەم چۆمەکە یەکتریان گرتبووەوە، ڕێگای ئان و ژیانیان بەرەو سنور هەڵدەلووشت، دڵم بەوە خۆش بوو کە لەناو ئەو کاروانانە کامەندم ناسی کامەندی گەورە و بەرێز بیرم بە کامەندەوە پڕ بوەوە، بەو هۆیەوە پتر هاتمەوە هۆش خۆم و کاسی و وڕیەکەم دەهات پەرت بێی باری گرانی لەسەر وجودم لادەدا گوراحییێک کەوتە لەشم مێشکم دەهاتەوە دۆخ و باری خۆی ڕوونتر دەبوو گورجتر دەجووڵایەوە.
لەزارگەلییەوە ئەوسەری کاروانە درێژەکە لەبەر چاومدا دیاری نەدەدا، سەدان پیرو لاو ژن و پیاو منداڵ و هەرزەکار لەناو پێچەکان دەجووڵانەوە دەهاتنە پێش و گەلییە دێوەکە لەسەرەخۆ قووتی دەدان، کاتێ ئەو حەشاماتەم دەدی، ئەو کاروانەم لەبەرچاو دەژیاوە کە دایکم کاتی خۆی بۆی باس کردبووم، ئەو کاروانەی لەگرانییەکەی دوای شەڕی گەورە لەو دیوەوە بەرەو گەرمیان کەوتبوونە سەر ڕوو، بەبێ دەستی خۆم لەگەڵ خۆم منگەم دەکرد بەکڕی گۆرانییەکەی ئەو کاروانە وون بووەم دەگوتەوە کە لەدایکمەوە فێری ببووم:
هۆ خاڵۆ ڕێبوار خاڵۆ
ڕێگاکەم دوورە
مەنزڵگا نادیار
هەنگاوی دژوار
هەر کوێرەوەری و پڕ لەئاسوورە
هۆ خاڵۆ خاڵۆ سەر لێ شێواوم
تین لێ بڕاوم
ڕێگا نازانم
بۆ کوێستان دەڕۆم
خەڵکی گەرمیانم
لەگەڵ گۆرانییەکە هەزارو یەک خەیاڵ ڕاویان دەنام غەریبیم هەڵدەستا لە دەروونمدا ئالەیێکی بێ دەنگ وەك جانەوەرێکی ترسێنەر سەری دەجووڵاندەوە وەڕەسی لەگیانمدا دەچەقاندەوە، لەگەڵ خۆم دەمپرسی:
- تاکەی ئەم چۆنیەتییە تاڵە؟ کەی مەنزڵگا دەدۆزینەوە؟
کەنگێ هەندێك ئاسوودە دەبین؟
فرمێسك لەچاوەکانمدا دەزا بۆ ئەوەی پێشیان

رۆمان

# ڕێگا

محەمەد مەولود (مەم)

پاکنووس و ئامادەکردن و سەرپەرشتی چاپ
ئیسماعیل تەنوور بەرزنجەیی

ستۆکهۆڵم - ١٩٩٤

پێ بگرم سەرم بەرەو ژوور بەرزکردەوە چاوەکانم لەپردە ئاسنینەکەی ناوەوەی دۆڵەقوڕڵە سەختەکە دەئالان، لەپڕ عەوڵای هاوڕێم لەناو گلێنەکانم وەدیارکەوت، عەوڵا وەك هەڵۆ لە ڕۆخ چەمەکە لەسەر کەپکە شاخێکی بڵند هەڵنیشتبوو کەمتی دیت هەڵسایە سەرپێ و دەستێکی بۆ بەرزکردمەوە.
لە کاروان جودا بوومەوە و بەرەو لای عەوڵا لام دا، عەوڵای هاوڕێم لەسەر بەردە زەلامەکە دابەزی کاتێ گەیشتینەوە یەکدی دەستی لەملم کرد لەبەر خۆیەوە پرسی:
- ئەوا دەڕۆن ها؟
وەهەر لەبەر خۆەوە گوتی:
- دەباشە خواتان لەگەڵ !
ئینجا پاش کەمێك وەستان پێی گوتم:
- ئاگات لەخۆبێ ڕێگاییێکی دوور و سەخت و پڕ ئازارە!.
ئاوڕێکم لە حەشاماتی کاروانەکان دایەوەو بەدەم ئاه هەڵکێشانەوە ڕووم بۆ لای عەوڵا وەرگێڕایەوە و بێ دەنگ بووم.
- خەڵکەکە برسین زۆرلێکراون بێ چارەن ئەگەر ڕێگایەکە هەربستێکی مردنێکی پێوەبێ دەبێ هەر خۆیان لێ بدەن!
عەوڵا ئەوها وەڵامی ئاهەکەی منی دایەوە و گوتی:
- بەڵام هەر دەبێ بژین هەردەبێ لەو چۆنیەتییە تاڵە ڕزگاربین.
لەگەڵ ئەو قسانەی من پتر دەستی عەوڵام دەگوشی و خۆمان لەیێك هەڵدەسووی کاتێ دەنگی پێ خوستی کامەند هاتە بەرگوێمان کە لەڕۆخ پردەکەوە بۆ دەم چەمەکە دادەبەزی بەهەنگاوی گورج بۆلای ئێمە دەهاتە پێش، هەردووکمان بە یەکجار ڕوومان لە کامەند کرد کە لێمان نزیك بوەوە بەدەنگێکی بڵند بانگی کرد:
- خودا سەلامەتتان کا دەڵێی ماڵئاوایی یەگجاری لە یەکتری دەکەن!
وەلەپاش هەناسە خواردنەوەییك گوتیەوە:
- بەزاتی خودا.. ئەه هەر ئەحمیکەو زۆری پێ ناچێ لەسەر ئەم شاخە بەرزانە یەکدی دەگرینەوە
- کامەند دەستێکی بۆ لووتکە بەرزەکان ڕایەڵ کرد کە لەگەڵ ڕۆژی ئەو بەیانییە ڕووناك و تێکەڵ بەئاسمان دەبوون بەو هۆیەوە بڵندتر دەهاتنە بەرچاو، عەوڵای هاوڕێشم چۆن بەڕوویێکی گەشەوە پێشوازی کامەندی دەکرد بێ ئەوەی ئاوڕێك لەمن باتەوە ڕووی قسەی تێ کردم و گوتی:
- خۆ پێی ئاوێ جارێکی دیکە بەیەکترتان بناسێنمەوە!
دیتنی کامەند ئارامێکی بێ سنووری خستە گیانم، هەموو خەیاڵ و جەنجاڵی ناوەوەمی وەدەرنا. دەروون و بیری هێدی کردمەوە، فەرامۆشییێکی زۆری پێ بەخشیم، لەناو ئەو هەست و فەرامۆشییەدا لەگەڵ خۆم لێکم دەدایەوە:
- شەوی ڕابووردوو لەژێر سێبەری داربەڕووە پیرەکان وەکو ئێستاکە وەها بەڕوون و ڕەوانی کامەندم نەدیبوو، ئەو وێنەیەی لەقسەو گفتوگۆ و ڕەوشتی دوێنێ ئێوارەی لەمێشکمدا بۆم نەخشاندبوو لەگەڵ وێنەی ڕاستەقینەی ئێستای هەرچەندە زۆر لەیێك دووریان نابینم بەڵام وێنەی ئیمڕۆکەی زۆر بەرین و زۆر فراوان ترە، کە بەرامبەری وەستابووم هەستم بە خۆشەویستییەکی ڕۆڵە و باوکانە قوتابی و مامۆستایانە دەکرد.
- گفتوگۆ و تامی زاری کامەند لە گفتوگۆی باوکی ڕەحمەتی دەکردم!
هەروا پەرۆشی و جووڵانەوە پڕ میهرەبانیەکەی گەلەك لە ڕەوشتی مامۆستا شەنگە دەچوو.
لەگەڵ پرسیارەکەی عەوڵای هاوڕێم بە بێ دەستی خۆم بانگم کرد:
- کامەند گەورەی هەموانە.
هەر فرمانێکی ئەو بەمنی بکا هەر فرمانێکی بەمنی هەبێ و لە ووزەی من بێ بەچاوان جێبەجێی دەکەم وە لەناو دڵی خۆم دا بەخۆم دەگوت:
- لەوشەوەی ڕابوردوو. کامەندم ئەوها کەوتە بەر دڵ و ئاسیم کەخەڵکی دیکە لە بوارێکی وا ڕاگوزار و ئاسایی مەگەر بەدەیان ساڵ ئەرجا ئەگەر یەکتری ئەوها بناسن.

عەولا دەستێکی لەسەر شانم دانا، دەستەکەی تری خستە ناو دەستەکانی کامەند بەسێیان بەرەو جادە قیرتاوەکە هەڵکشاین، عەولا بەدەم ڕێگاوە هەناسەیێکی تووندی هەڵکێشاو ڕووبەڕووی من گوتی:

- کامەند ئەوە دەزانێ دەبێ تۆش بیزانی کە منیش هەر تەنیا شەوێکی دیکەم لێرەماوە!

وەبە بزەییێکی گەشەوە ڕووی لە کامەند کردوو لەبەر خۆیەوە گوتی:

- سبەی شەو بەسەر ئەو شاخانەوەم!

ئینجا پاش چاو قوچانێك بێ دەنگی بەهێمنی گوتی:

- کۆمەڵێك لە هەڤاڵەکانمان گەیشتوونەتە کۆڕەك دەبێ ئێمەش وورده وورده بیان گەینێ!

کاتێ عەولا ئەو خەبەرەی گەیاند، یەکسەر بیرم بۆ لای دایکم چوو کە دوێنێ شەو لەسەر بەرماڵەکەی ڕاست بوەوە و هەر تەنیا بۆ ئەوەی پێم بڵێ:

- ڕۆڵە شێرکۆ دەبێ مام هۆمەر لەچۆنیەتی عەولا ئاگاداربکەین!

وەڕای سپاردم کە:

- هەرکاتێ گەیشتینەوە گوند پێش هەموو کارێك دەبێ‌خەبەری عەولا بگەیەنیتە باوکی ئێ کوڕی خۆم!!

پاش ئەو ڕاسپاردەیە بەخۆشییێکەوە لەگەڵ خۆیدا مرتەی دەکرد:

- ئای هۆمەر بزانێ عەولا لێرەیە بزانێ عەولا ماوەوساغ و بێ غەشە لە خۆشیاندا باڵ دەگرێ هەتا خۆی دەگەیەنێتێ ئارامی لێ هەڵدەگیرێ.

ئەوجا ئاهێکی دوور و درێژی دەخواردەوە و نووزەییێکی دەکرد و بۆی کڕ دەبوو

منیش لەگەڵ ئاهو نووزەکەی دایکم دڵم تەنگ دەبوو، بەخەیاڵی خۆم وام لێکدەدایەوە کە هەبێ و نەبێ ئەویش یادی گولیزاری خوشکە جوانەمەرگەکەم دەکاتەوە، هەروا ڕەحمەت بۆ دەستەخوشکەکەی بۆ دایکی عەولای هاوڕێم وەڕێ دەکا، لە دڵی خۆمدا دەمگوت:

- تازە مام هۆمەر لەکوێ دەستی بە کووڕە وون بووەکەی دەگاتەوە چاوی بە دیدەنی عەولا ڕۆشن دەبێتەوە؟

- تازە عەولا بوو بەو کەوە خورتەی کە لەسەر کەپکە بەرزەکان ڕکە دەکا هەموو ڕاوچی‌یەك ڕێگای بۆ نابا!

ئاهێکی گەرم و پڕ سۆزم دەخواردەوە، ئەم بیرانەم وەك برووسکە بەمێشکدا تێپەڕ دەبوون، لەبەر ئەوەی کامەندمان لەگەڵ بوو ڕێم بەخۆم نەدا پتر تێکەڵ بەم بیرو لێکدانەوە کت و پڕانە ببم یان لەو هەموو ویستەی ئەو کاتەم دووربکەومەوە، سەرێکم بۆ کامەند هەڵبڕی و وەکو بمەوێ لێی بپرسم:

- ئەدی ئەتوو؟

- ئەدی ئەمن من چ بکەم؟

کامەند وەکو ئەویش لە ڕوانینەکەی من گەیشتبێ بزەییێکی بۆ کردم و بەهێمنی گوتی:

- من کاری دیکەم هەن ڕوەو جێگاییێکی تر دەڕۆم!

پاش وەستانێکی کەم قسەکەی وەها تەواو کرد:

- بەڵام لە ئەنجامدا هەموومان یەکتری دەگرینەوە!

لەگەڵ ئەو قسەیەی کامەند تارمایی کامەرانییێك لەسەر ڕووی عەولای هاوڕێم دیاری دەدا، چاوەکانی پتر گەش دەبوونەوە. ئەویش سەرێکی هەڵبڕی بەرز بەرز زۆر بڵند دەیڕوانی وەکو لەسەر لووتکەی بەرزی شاخە سەرکەشەکان یان لەقووڵایی ئاسمانی بێ دوایی چاوی لەشتێك گیرکردبێ کە لەبەر چاوی من بزر و نادیار بێ،



کە لەڕووی عەولا وورد دەبوومەوە لەدڵی خۆمدا هەزار و یەك بیر و ئازار و ئاواتم لەدڵ دەڕوان چرۆیان هەڵدەدا و دەکەوتمە شیکردنەوەی ئەو بیرانە، لە ناوەوەم لەگەڵ خۆم دەدوام:

- ئای هاوڕێی خۆشەویستم ئای هاوتەمەن و هاوگەرەك وهاوگوندم ئای عەولا چەند هەڤاڵێکی بەڕێز و خۆشەویستی هەمووان چەند لاوێکی ڕاست و فیداکاری!

لەگەڵ خۆم بەڵێنم پێ دەدا کە:

- مەرج بێ بەتەنیا بەجێت نەهێڵم شەرت بێ منیش بۆ ئەو بەرزاییانە تەکان بدەم بەو هەورازانە هەڵبگەڕێم کە تۆو کامەند و هاوڕێیەکانی دیکەمان هۆگری بوون ئەشقی بوون بە هەموو نرخێك دەتانەوێ بگەن بەو عەشقە.

سەرێکم لە لووتکەکان هەڵبڕی و تاچاوم لە ڕۆژ چەقاندن لەگەڵ خۆم دەمگوت:

- بەڵێ هەڵوە جێگایان سەر تۆپکەی شاخ و گەپك و هەوراز وهەڵدێرو بڵندایی ئاسمانە!

ژارکی فراوانی گەلی کاروانە درێژەکەی قووت دابوو تاك وتووك پیادە و شەکەت پیرو شەل و سەقەت لەتەك ولاخی لەڕو بێ تووك لەدواوە کەلەشیان لە دوخۆ دەکێشا و بەهێواشی دەچوونە پێش، هەوڵیان دەدا تینیان دەدایە بەرخۆ تاکو بگەنە ڕیزی کاروانە کە، دوو داراشی گەورە لە ئاسمانەوە باڵیان لێك دەدا بەسەر کاروانەکەوە ئەم سەرو ئەو سەری گەلی یەکەیان دەکرد، قەبۆ قەبۆی چەند نێرەکەوێك لەوبەر و لەم بەری دیواری شاخەکان دەنگیان دەدایەوە و تێکەڵ بە هاشەی ئاوی ڕووبارە ڕشتەکە و پێ خوستی کاروانەکە دەبوو، نێرەکەوەکان لەپڕ فجووقیان کرد بۆ ناو ئەشکەوتەکان هەڵفڕین وەکو چاویان بە داراشەکان کەوتبێ و لەترسی ئەوان پەنایان بۆ ئەشکەوتەکان بردبێ، کامەند بەتیژی چاوی لەداراشەکان بڕین، کاتێ کەوەکان بۆ ئەشکەوتەکان هەڵفڕین کامەند سەیرێکی عەولای کردوو ڕووی گوازتەوە لای من و بزەییێکی بۆ کردم.

لەگەڵ عەولای هاوڕێم دەستمان هاویشتەوە ملی یەکدی، کاتێ لەگەڵ کامەندیش ماڵ ئاواییمان لێ دەکرد ئەو دەستێکی لەلاشانم دا بەواتاییێکی پتەو و پڕ بڕوایی گوتی:

- خەم مەخۆ حەق جێگای خۆی هەر دەگرێ جا ئیمڕۆ یان سبەی، نزیك یا دوور زوو یان درەنگ دەبێ ئەم بارە چەوتەو ئا لە بارە بەبارێکی‌تر بگۆڕێ بەبارێکی چاکتر.

چاوم لە چاوە بریسکەدارەکانی عەولا ئالابوون کە دەیگوت:

- دەبێ هەموو وەکو ئێمە دەمانهەوێ ئەوها ڕاست و دروست بێ و بێتەوە دۆخی ڕەوا و سروشتی خۆی.

- دەبێ هەموو چەوتی و خوار و کەچییێ ڕاست بکرێتەوە لەنگەرو تەرازووی ژیان ئەوها بە کەچی نەمێنێتەوە!

وە بەدەم بزەییێکی تاڵەوە ڕووی لە کامەند کرد و پرسی:

- چۆن ڕێك دەکەوێ دونیا بە بەرەواژی بسووڕێ؟

ئینجا سەرێکی هەڵبڕی و لەبەر خۆیەوە گوتی:

- ئەمە دەرسێکە کامەند فێری کردووم و بڕوایی قایمم پێی هەیە.

وە دووبارەی کردەوە:

- هەرگیز نابێ دونیا بە بەرەواژی بسووڕێتەوە!

ئینجا ڕووی وەرگێڕایەوە لای من و پرسی:

- ئێمەش لە کۆمەڵەکەمان پەیمان و بڕواییمان وەها نەبوو؟

منیش هەر تەنیا ئەوەندەم بۆ کرا بەهێمنی سەر بهەژێنم و پتر بچمە ناو قووڵایی چاوە تیژەکانی عەولا.

کاتێ لەگەڵ کامەندیش بەجێمان هێشت و بەهەنگاوی بەرین و گورج ملمان بەڕێگاوە نا، لەگەڵ خۆم بیرم دەکردەوە:

- چاوەکانی عەولا وەکو ڕۆژانی قوتابییەتی گەش و بریسکەدار ببوونەوە. خۆشەویستی‌یەکی گەورە و زۆر تری عەولام لەناوەند دڵدا بۆ چەسپا.

- کامەندیش ئاوڕێکی میهرەبانانەی لێ دایەوە و دەستێکی بۆ بەرزکردەوە!.

# "مەم" بەقەڵەمی مەم

**لەدووەم دیداری چیرۆکی کوردی لە هاوینەهەواری سەلاحەدین لە ئابی ١٩٨٢ محەمەد مەولود مەم بەم جۆرە باسی پوختەی ئەزموونی چیرۆکنووسینی خۆی کرد:**

بەڕێزان:

ڕەنگە هەندێك لە ئێوەی بەڕێزوایان دانابێ کە تاقیکردنەوەکانی نووسەرێك شتێکی تایبەتیە واتە زاتیەتێکی صرفە، ئەگەر بەتەمای ئەوەبن چۆن لەبەردەکەم، چۆن دەخۆم، چۆن دەخەوم، ئەوا حیساب بکەن ڕەنجی ئەمڕۆمان بەخەسارچوو.

پیرێژنەکەی دایکم دەیگوت ئەگەر جۆی زەرد کراو "واتە نیوەکوڵاو" بدەی بەمریشکی هێلکەکەر ئەوا هێلکەی زیاد دەکات، تاقیکردنەوەکانی زانستیش دەرمانی وایان دۆزیوەتەوە کە هێلکەی مریشکی پێ ڕەنگاوڕەنگ دەبێ.

ڕەنگە ئەمانە ڕاست بن بەڵام نووسەر ئەمجۆرە تاقیکردنەوانەی لێ نایێن، مەرج نیە هەورە تریشقەیان زەردەپەڕ یان مانگی چواردە دەرگای ئیبداع بۆ نووسەر بخاتە سەر پشت، یان دیمەنی جوان.. کچی جوان.. گوڵی جوان.. شاعیر وەشیعر بهێنێ.

بەڕای من تاقیکردنەوەکانی نووسەر هەرچەندە زانستیش بن دەبێ بەشێك بن لەتاقیکردنەوەکانی کۆمەڵەکەی، لەبەر ئەوە تاقیکردنەوەکانی من پترگشتین و پەیوەندیان بەباری گشتی گەلەکەمەوە هەیە، لەبەر ئەوە لەو سەودایەدا دەچمە ناوباسەکە.

کەمنداڵ بووم لەگەڵ زارۆکانی گەڕەك دەچووینە سەر جۆگەلە ئاوەکە، لەدارهەنجیرەکە کارکە هەنجیرێکمان دەچنی، ئەوەرێکی دارسان بەناوەندیدا ڕایەڵ دەکرد، بەزلکە دار بەدەوری هەنجیرەکە پەڕمان دەچاند، ئینجا بەسەر جۆگەلەکەدا هەڵمان دەخست، کە پەڕەکان دەگەیشتنە ئاوی جۆگەلەکە هەنجیرەکەیان دەسووڕاند، لەگەڵ سووڕی هەنجیرەکە ئێمەیش بەدەوری خۆماندا دەسووڕاین و بانگمان دەکرد:

- هۆ ئاشەکە سووڕا    ئاشەکە کەوتە گەڕ.

بەم ڕەنگە بەخەیاڵی بچووکانەی خۆمان ئاشمان دروست دەکرد، هەتا ئاوەکەشمان پتر دەکرد ئاشەکە بەگوڕتر دەسووڕا، کە ئاوەکەشمان چك دەکرد ئاش دەوەستا، ووردەوردەش ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە کەئەگەر ئاوەکە لەبەرزاییەوە بەرەو خوار بێتەوە بەگوڕتر دەبێ و تەوژمی بەهێزتر، ئاشەکەش توندتر وەگەڕ دەخا، کە شارۆچکەشمان دروست دەکردن بەتاقیکردنەوە دەگەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە هەتا بناغەی خانووەکانی شارۆچکەکەمان پانتر و بەتینتر بن ئەوا دەتوانین کۆشکی بەرزترو نهۆمی زۆرتر بەسەریەکەوە بنێین.

لەناو جۆگەلەکەدا بەبەری پێ شەقامان دەکێشان، هەندێکمان شەقامی ڕاست، هەندێکمان کەوانەیی، هەندێك بازنەیی و چوارگۆشەیی، بەڵام ئەو منداڵە دەبووە سەردەستەو ئازایی دەبردەوە کەجادەی پێچاوپێچی پرکۆسپ و قۆرت و هەڵدێرو ئاڵۆزی دەکێشان و بەراکردن بێ هەڵەو بێ وەستان بەسەری دادەچووەوە، ئەمانە یادگاری سەردەمی منداڵین، ڕەنگە ئێرە جێگای گێڕانەوەیان نەبێ بەڵام چونکی پەیوەندیان بە تاقیکردنەوەکانەوە هەیە هەر بۆنموونە هێناومەتەوە.

* * * *

گوندەکەم چۆن هەموو جوانی سروشتی تێدا کۆببووەوە، ساردو سڕی بەفری زستان لەو جوانییە سروشتیەی پتر دەکردو باری ژیانی خەلکە هەژارەکەی گرانتر دەکرد، هەروا هەموو تناقچات- و ئاڵەباری ژیانیشی بە کۆڵەوە بوو، لەو گوندەم جوولەکە، دیان "مەسیحی"، کرمانج، بەگزادە، ئاغا    لەسەری ئەم بەشانەش دەستەی پیاوانی حکومەت و بنەماڵەی میرەکان وەکو دێو دوولینگیان داکوتابوو، جوولەکە لەپاش دیانەکان، ئەمانەش لەدوای کرمانجەکان، کرمانجیش لەرکێف بەگزادەو ئاغاکان دەگەیشتنە سەرەوە، دەوڵەمەندی جوولەکەو دیانی لەکرمانجی هەژار بەرێ و جێ ترومردەگیران، کرمانجی دەوڵەمەندیش لەبەگزادەکان بەرووت تر بوون، مەلا ڕیش سپیەکەش هەر پێنج فەرزە بەسەر قووچکەی مزگەوت دەکەوت و بانگی یەکسانی ڕادەهێشت، ئەوەی لەم چۆنیەتیە سەرنجی ڕادەکێشام ئەوەبوو کە هەموو ئەم بەشە بەشخوراوانەش لەگەڵ یەکدا ناتەباو دووڵ بوون، تاقە شتێك کە کۆی کردبوونەوە بەزارخواپەرستی و بەکردار ڕازی کردنی میروسیری بوو.

بەم ڕەنگە دەوری منداڵیم لەگەڵ شەرە گەڕەك ڕابوارد، گوێچکەم پڕ باسی دزی و پیاوکوژی و زەوت کرن و جەوروستەم بوو، گەلێك جار دەمدیت پۆلیس خەلکی گوندیان کۆدەکردنەوە، وەك ڕانە مەڕ. بۆ بێگار لێیان دەخوڕین، زۆرجار لەگەڵ خۆما دەمپرسی:

- چۆن ئەم هەموو خەلکە ڕەشوڕووتە بەکرێ و بەبێ سەرپێچی ئەوها مل دەدەن؟ وەڵامی ئەم پرسیارەم ئەو کاتە چنگ کەوت کە بووم بەشوانی ڕەوەێك عەلەشیش، بەیانیان شوورکەدارێکم وەدەست دەگرت، کەڕام دەوەشاند گڤەی دەهات، قەلەمموونەکانم دەدانە پێش خۆم، تەنانەت قەلەموونێك لەرەوە دەرنەدەچوو، وەڵامەکەش وەکولێکدانەوە و پرسیارێکی تر بوو کە بەخۆم دەگوتەوە:

- بزانە چۆنیەتی خەلکی گوندو ئەم عەلەشیشانە چەند وەیێك دەچن.

بەخەیاڵی منداڵانەی خۆم عالەمی گوندەکەم دەکرد بەدوو بەشەوە، بەشێکی پۆلیس و بەشەکەی تری عەلەشیش.

* * * *

لەپۆلەکانی سەرەتایی قەشەی بەڕێز "جبرائیل شێر" مامۆستای زمانی کوردیمان بوو، ئەم ئینسانە مەزنە خوێنی خۆشەویستی ئەدەبی و زمان وڵات و کەلەپووری نەتەوەکەمی لەدەمارەکانمدا جوولاندەوە، ئەو حاجی قادری کۆیی پێ ناساندم، جوانیی شیعری نالی و وەفایی و ئاوات و ئازاری مەم و زینی ڕژاندە گیانم، ئەگەرچی مامۆستای یەکەمم دایکم بوو، بەچیرۆکی فۆلکلۆری و ئەفسانە و پەندی پێشینان فرچکی دابووم، بەباس و خواسی سەفەر بەرو گرانیە گەورەکەو ڕشانەوەو ڕۆژە ناڵەبارەکانی کۆمەڵەکەمان کولانکەی ژیانی بۆ ڕوون کردمەوە، بەقارەمانیەتی پیاوانی دمدم و شێخ فەرخ و خەج و سیامەندو برایمۆك و لەیل و مەجروم و تێر شیری کردبووم، تاکو قۆناغی سەرەتاییم تەواوکرد شیعرەکانی حاجیم دووردەکردنەوە، چیرۆك و ئەو قسانە و سەربوور دەکانی دایکم لەلاڕوونتر دەبوونەوە، بۆ قۆناغی خوێندنی ناوەندی کەوتمە باوەش شارە پیرەکەی هەولێر، لەم شارەدا پتر بەژیان ئاشنابووم، کەوتمە ناورێکخراوی ئیشتمانی، بەو هۆیەوە لایەنی تری ژیانم بۆ ڕوون بووەوە، فێری زمانی عارەبی بووم، لەتەك دیوانەکۆنەکەی حاجی و تایەربەگ و شێخ ڕەزاو دیاری و یادگاری لاوان و کتێبەکانی مەنفەلووتی و زیات و ئەحمەد و سەلامە موساو زەنوون ئەیوب و عەبەسبوسم کردنە هۆگرو دۆست، بەهۆی ئەمانەشەوە دەرگای ئەدەبیاتی عەرەب و ڕۆژهەڵاتم و ڕۆژئاوام بۆکرایەوە.

ئەفسانەكانی هیندو گریکم خوێندەوە، ئاشناییم لەگەڵ بلزاك پەیداكرد، چۆنیەتی مردنی لۆردبایرۆن دڵتەنگی كردم، چیرۆكەكانی مۆپاسان كۆمەڵێكی لەكۆمەڵەكەی خۆم فراوانتریان پێ ناساندم، جوانیم لەگەڵ لامارتین و شاتۆ بریان هەڵدەچۆڕاند، ڕك و فرمێسكم بۆ جان ڤالجان و مام تۆما هەڵدەڕشتن، ئازارم تێكەڵ بە ئازارەكانی تۆلستۆی و ڤارتەر دەبوون.

لەو ڕۆژانەدا.. شەڕی جیهانی دووەم هەموو دنیای گرتبووەوە، لەگەڵ مەلا كوێرە بێ ڕوناكەكە دەم گوتەوە:

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێكە دونیا شڵەژاوە

هەركەس بەجارێ جگەری قیمە كراوە

منیش بەڤەریكیەوە بەرەنگای ڕێگای سەختی ژیان بووم، ژیانی منیش شڵەژا، برسیەتی پتر پێی پێوەنام، ناچار ڤوتابخانەم لەگەڵ ئاخێكی سارد بۆ دەرەوەی سنووری ژیانم تێهەڵدا، خۆم هاویشتە ناو گێژەڵووكەو گەرداوی ژیان، پێویست بوو نان بۆخۆم و پاشماوەی بارگە كۆچكردووەكەم پەیدا بكەم، لەوماوە درێژەی لەسنوور فەرمانبەر بووم كەوتمە ناو لەعنەتی سنوورو بەتەواوی خزامە ناو كانگای دەردی كۆمەڵ، ناوجەرگەی ڕووداوی تاڵ و سوێر و ملم بەكەندو كۆسپ و چیای سەختی ژیانەوە نا، لەوماوەداگەلێك ڕاستی ئەم ژیانەم بۆ دەركەوتن، هەوڵمدا ئەو ڕاستیانەی من دەیانبینم و هەستیان پێ دەكەم لەپێش چاوی ڕەشوڕوتی خەلك ڤیتیان بكەمەوە، هەستی ئەوانیش بجولێنمەوە، ئەوەڵ جار ڕێگای شیعرم گرتەبەر، لام وابوو دەتوانم بەم ڕێگایەوە بگەم بە هەوارگەی دڵی ئەوان، بەڵام پاش ماوەیێكی كورت ئەوڕێگایەم لێ وون بوو.

ئەوسەردەمە كتێب لەنان هەرزانتر بوو، پتر كتێبم دەخوێندەوە، جگە لەئەدەبیاتی كۆمەڵە سیاسیەكانی ئەو سەردەمە.. چیرۆك نووسە گەورەكانم ناسی، چیخەفم ناسی، خۆزیام دەخواست بتوانم وەك ئەو نووسەرە ئەمرە. بچمە ناو دەروونی ئینسان و ببم بە بەشێك لەخەمی كۆمەڵەكەم، چیخۆف ڕێگای چیرۆك نووسینی پیشاندام، پاڵی پێوەنام ڤوولتر بەدەریای ئەدەبی چیرۆكدا نقووم ببم، ئاشناییم لەگەڵ تۆلستۆی و دستۆڤسكی و گۆركی پەیدا كرد، لەو سەردەمەی ئەمانەم دەناسین یەكەم چیرۆكم بەناوی "برسیەتی بەهێزترە" نووسیوە.

بەهۆی گەلاوێژ بەشێك لە ئەدەبیاتی بێگانەم بەكوردی خوێندەوە، نووسینەكانی بلە و سەجادی، شیعرەكانی بێكەس و گۆران و ئەسیری چێژی ئەدەبیان لاخۆشتر كردم و چارە نووسیان بەستم بە چارەنووسی ئەدەب بەتایبەتی چیرۆك ئاگەیاندمیانە قەسرە تەلیسماویەكەی كافكا، ماوەیەك لەناو قەسرە كە گەڕام، سەرم لەناو عالەمەكەی پیكێیت و ئاداموڤ دەسووڕا، خۆم لەناو غەریبی كامۆ دەدۆزیەوەو تێكەڵاوی-سرء التفاهم- ەكەی دەبووم، لەقورنەیەكی دادگای كافكا شێخ مەلا عەبدولقەدوسی خوالێخۆشبووم دیتەوە، لەوێش ڕەشوڕووتێكی زۆر وەك دیوار دەوریان دابوو، كە ئەو باسی عەزاب و دۆزەخی دەكردو وەسفی لاشەی وەك كەباب لەشیش دراوو ئافرەتی بەمەمك لەزاركی كورەی ئاگر هەڵواسراوی دەكرد كەچاویان وەك كوورەی زەردەواڵەیەو لێویان دەكەنە تەختەبەرە، ددانیان وەك پێمەڕەن، ئەمانە دەستیان بەناڵە و هاوار دەكرد، شێوەنیان دادەمەزراندو دیوارەكەیان دەهەژاند، كەچەناوەرەكەی پیكێتم ناسی وێنەی ئەژدیها هەشت سەرەكەی ئەفسانەكانی ڕۆژهەڵات و مەرجانی جادووی ئەفسانەكانی كوردیم دەهاتنەوە بەرچاو، بەكارتێكردنی ئەمانەوە چیرۆكی "-قوچكە- و سەرەتاو دوایی- و عاجباتی هەشتەم- م نووسی.

ئەم وێنانەم هێنانەوە هەر لەبەر وێكچوونیان بوو و بەس، دەنا بەبێ یەكودوو پێ لەوە دەنێم كە نەمتوانیوە ئەم سێ كەڵە نووسەرە هەزم بكەم یان ئەو كەم خۆراكەی لەوانم خواردووە تێری نەكردووم، برواشم بەگەڕانەوەنی‌یە بۆ عالەمی تەلیسم و دێوو درنج، من كە پیاوێكی ئاساییم و دەمەوێ شتێك بەم خەلكە بڵێم ئەگەر بەوێ خەلكە كە تێم بگەن دەبێ بەزمانی ئەوانەوە بدوێم، دەستووری فیكری ئەوان بەیەكجاری نەسڕمەوە.

كە بۆ خەلكی ئەم وڵاتە دەنووسم دەبێ پێشەكی باری سایكۆلۆژی و كۆمەڵایەتی ئەو خەلكە بزانم كە دەمەوێ بەهۆی چیرۆكەوە مامڵەتیان لەگەڵدا بكەم، دەبێ پێر لەوە بكەمەوە چۆن گرێ كوێرەكەی هەزاران ساڵیان دەكەمەوەو دڕندە ستەم كراوەكەی هەزاران ساڵەی دەروونیان كەیی و بەرەڵلا دەكەم.

هەرگیز ناتوانم وەكو نووسەرێكی ڕۆژئاوا كە بۆ خەلكی ڕۆژئاوا دەنووسن وەكو ئەو نووسەرە بۆ خەلكی ڕۆژهەڵات بنووسم، چۆن دەتوانم بەخەلك بڵێم ئەوەی باوكی خۆی بكوژێ قارەمانە؟ هەتا لەلایەن شێوەشەوە بەلای من ئەمە ڕاستە، هەتا لەشێوەش.

مومكن نی‌یە هەتا فرۆكەخانە لەگوندی زەڵم دروست نەكرێ بە فرۆكە لەو گوندە دابەزم.. لەگەڵ بڕوایی پتەویشم بەوەی كە دەبێ ڕۆژێك بتوانم بەفرۆكە بچم بۆ ئەو گوندە، ماوەیەكی كەم لەڕۆژئاوادا ژیاوم، لە كۆڵانەكان.. لەناو پاس شەمەندەفەر گازینۆكان.. چێشتخانەكان.. لە پاركەكان كوڕ وكچ پەردەیەكیان لەنێواندانی‌یە، سێكس لەوێ مەفهومێكی تایبەتی و مەعقولی هەیە، ئەوانەی لەو جێگایانە.. لەعالەمی سێكسدا دەیانبینین ئەوا ڕۆژانی یەكشەمە بەیەكەوە لەڕیزەكانی كەلێسا دەیاندۆزینەوە.

هەرگیز پێم وانەبووە وەپێش عەسری خۆم كەوتووم یان زووتر لەوادە و بەكامێلیش خولقاوم دەنا هانام دەبردە بەر ئەو جیهازەی دەڵێن گیاڵلەبەر دەخەوێنێ.

لەتاقیكردنەوەكانم ئیمان بەخاك و بەئینسان دروشمی یەكجاریم بوون، بڕواییم وابووە كە پێم لەو زەوییە چەقیون، ڕەگم لەو خاكە قووڵ داكوتاون، گیانم دابەستەی ئەو خاكەیە كە لەسەری دەژیم، بەناوو هەوای ئەشوغادەكەم، خۆشەویستیم بۆ ئینسان بەگشتی و بۆ ئینسانی وڵاتەكەم بەتایبەتی بێ دوایییە، هەرگیز بڕوایم بەقارەمانی خود سیفەت نەبووە.

هۆگری پیاهەڵدان و ئافەرینی ساختەو دەست لەپشت دان نەبووم، ئەمانەم بەهەڵدێرێك ژماردوون كە نووسەر بەهۆیەوە لەخشتە دەچێ و هەڵدەخلیسكێ و دەدۆزێ. دەگوترێ چیرۆك نووس شاهیدی سەردەمی خۆیەتی، بەلای منەوە ئەم وتەیە ناتەواوە.

ئادەمیزاد لەغزێكە كلیلی شیكردنەوەی لەگەروی حووتەكانی دەریادایە، ئەشكەوتێكە دەنگی سەدەكانی دووبارە دەكاتەوە، ئاسمانێكە بێ دوایی، چیرۆك نووسیش ئادەمیزادە هەرچەند بكۆشێ ناتوانێ خۆی بەعالەم بناسێنێ.

شەقڵاوە: لەگەڵ هەژار و كۆمەڵە برادەرێك

تیژی

ڕۆژنامەنووسی

# ئاوی هەولێر و شارۆخ و شووتی

شوکور بۆ خودا گیروگرفتی گامێش و گامێشەوانەکانی هەولێر سەبارەت بەنەبوونی ئاو بەناردنیان بۆ دەر زێی بادینان جێبەجێ کرا، وەکو فۆلکلۆری کوردی دەڵێ:

- گامێش تەیرێکی‌سووکە دەفڕێ دەچتە کوێستانێ.

بەڵام گیروگرفتێك کەلەم ڕووەوە مابێ نیسبەت بەدانیشتوانی شارە، بێ ئاوی لەهاویندا شتێکی ناخۆشە و پێویستە بە عیلاجێکی فەورییە، ناڵێم ئەوانەی ڕەز و باخچەی زۆریان لەماڵەکانیانداکردووە واز لە قازانج و کەیف و سیحەتی خۆیان بێنن، بەڵام پێویستە:

- سەرتاشەکانی شار بۆ سەرورێش تاشینی خەڵك ئەوەندە ئاو خەرج نەکەن.
- شەربەت فرۆشەکان ئەم هەموو ئاوەنەکەن بەشەربەت.
- گەرماوەکانی شار بەدرێژایی هاوین داخرێن.
- لەمزگەوتەکان مەلافتوابدەن و خەڵکی تێبگەیەنن کەتەیەموم کارێکی شەرعییە.
- خەڵکی شار بەزۆری قورسی (ئەعتاع) بەکاربهێنن بۆ فێنك کردنەوەی گەروو دەروونیان.
- لەیانەو چایخانەو چێشتخانەکان لەجیاتی گلاسێك نیوگلاس ئاو بدەن ودۆلکە مەنع بکەن.
- خەڵکەکە ئاگایان لەخۆیان بێ زۆر ئارەقە نەکەن چونکە ئارەقە نسبەتی ئاو لەلەش کەم دەکاتەوە.
- بەبۆنەی زۆری شووتی تەرۆزی و شارۆخ هەرماڵە "عصارە" بکرێت.

ئەمانە تێکڕا دەبنەهۆی کەمکردنەوەی تەوژمی ئەزمەی ئاوی ئەم ساڵ!

**خالۆی ڕێبوار (مەم)**




زاری

گۆڤارێکی مانگانەیە شارەوانی هەولێر دەری دەکا



کۆیە.. ڕۆژی بەردەڵادان لەسەر پەیکەری حاجی قادری کۆیی لەلای ڕاستەوە سێیەمیان "مەم"ە

## محەمەد مەولود "مەم"

**شێرکۆ بێکەس**

وشەیەکی لەش بەبارو
گیانێك وەك هاوینانی "شەقڵاوە" و
بەفری "سەفین"
پاك و ڕووناك.
دەوارێکی هۆبەی چیرۆك
لەبەردەمی ڕەشەبادا
فوارە ئاوێکی سەرقەڵا و
قسەی فێنك.
"ڕێگای گەنم" وەختێ ئاونگ تەڕی ئەکا
لەبەردەمی مانگە شەودا.
ڕۆژێکیان هەر ئەوەندەی "پەنجافلسی" یەك
برك و ژانێ
لەناو هەناویا هەڵتۆقی و
ئیتر ئەوسا بەگڤە گڤ مەرگ هات و
فڕانی وەك گوڵ ئەستێرەی بن بنارو
گەڵای دەم "با"!.

لەدیوانی (نسێ) وە.
١٩٩٧


بەغدا ١٩٦٤ ڕۆژانی مانگی هەنگوینی لەگەڵ خاتو ئاغەرین.

## پرۆژەی داهاتوومان تایبەتە بە پرۆفسیۆر کەمال مەزهەری مێژوونووس